# خۆشەویستی

فاتح مەلا رەسول شارستێنی

چاپی یەکەم

٢٠١٤ ز - ١٤٣٦ ک



ناوی کتێب: خۆشەویستی

بابەت: وتار

نووسەر: فاتح مەلا ڕەسول شارستێنی

دیزاین: جەمال دەروێش

تیراژ: ٥٠٠ دانە

چاپی یەکەم ٢٠١٤ ز ١٤٣٦ ك

چاپخانەی پیرەمێرد







## خۆشەویستی - بەشی یەکەم

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه أجمعين

گەر بە وردی بڕوانینە مرۆڤ لەوە دڵنیا دەبین و تێ دەگەین کە پێکهاتەیەکی چونیەکە، جەستەی مرۆڤیش کۆمەڵێك غەریزەی تێدایە ئەم غەریزانە بۆ خزمەتو مانەوەی بەشە ماددیەکەیەتی.

یەکێك لەو غەریزانە «غەریزەی برسیەتی»یە، حەزکردن بە خواردنی باش و جۆراوجۆرە، چونکە ئەگەر مرۆڤ هەستی بە برسیەتی نەکردایەو حەزی بە خواردنی پاکو بە تام وباش نەبوایە، ئەوا دەمردو لاشەی وشك دەبۆوە لە برساندا و مرۆڤ هەوڵی خۆتێرکردنی نەدەدا، جا ئەم غەریزەی برسییەتیەت کاتێك زیاد دەبێ کە برسیت بێت و گەدەت بەتاڵ بێت، کە برسی بووی‌و بۆنی خواردن هاتە بەرلوتت، لیکە ڕژێنەکان ناو دەم پڕ دەکەن لە لیکو مرۆڤ یەکسەر لە هەوڵو هەڵپەی پەیداکردنی خۆراکدا دەبێت.

یەکێکی تر لەو غەریزانە: «غەریزەی هەست کردن بەسەرماو گەرما»



لەو کاتەدا کە سـەرما یان گەرما زۆری بۆ هێنای یەکسـەر مێشـك فەرمانت پێ دەدات کە خۆت بپارێزیو دژەکەی بەکاربهێنی، بەم شێوەیە بە هۆی ئەم غەریزەیەوە لاشەت لە فەوتان و تیاچوون دەپارێزرێ.

غەریزەیەکی تری مرۆڤ: «غەریزەی هەستکردنە بە ترس»

لە کاتی ڕووداوی ناخۆشو سامناکو جەنگدا، ئەگەر ئەم هەستی ترسە لە ناو ناخی مرۆڤدا نەبوایە، ئەوکات مرۆڤ خۆی نەدەپاراست و لە مەترسی دوور نەدەکەوتەوە و سەرەنجام دەفەوتا، لە ماوەیەکی کەمدا ئەمانە بە گشتی ئەو ویستانە بوون کە مرۆڤ پێویستیەکانی جەستەی و پێویستیە دونیایی و ماددیەکانی پێ پڕدەکاتەوە، بەڵام لەو غەریزانەی کە لە ناو ناخی مرۆڤدان و مرۆڤ بە هەموو بونیەوە پێویسـتی پێیەتی و بە تایبەت بەشە ناوەکیەکەی مرۆڤ و نەفسی پێویسـتیەتی و تەڕو پاراو دەبێـت پێی، ناخی مرۆڤ لە بیابانیکی وشـك و بێئاو و پڕ لە دڕکوداڵ و وێرانە دەگۆڕێت بۆ ئاوەدانیەکی پڕ لە سەوزایی و جۆگەو ڕوبارو گوڵ و گوڵزار و دەیکاتە مرۆڤێکی کامەران وەکو خۆشەویسـتی مرۆڤ بۆ مەعبودو پەرسـتراوەکەی، مرۆڤی ئیماندار خوای پەروەردگاری لە هەموو شـتێ خۆشتردەوێت ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾، هەموو ئەو مرۆڤانەش کە مەعبودیان بە ڕاسـتی ناناسـن و شـوێنی پەرستراوێکی دەسـتکردی خۆیان یان وەکو خۆیان یان کەمتر لە خۆیان کەوتوون، خۆشەویسـتیەکی زۆریـان هەیە بۆ پەرسـتراوەکانیان ئەی ئەوە نیە! بتپەرسـت کە




بتەکەی بە دەســتی خۆی دروســت کردووە، ئامادەیــە لە پێناویدا خۆی بە کوشــت بدات وەکو موشــریکەکان کە لەسەر( لات و عوززا و مەنــات) دەهاتنە شــەڕو جەنگی موســڵمانەکانو خۆیان دەدا بە کوشــت هێندەیان بە لاوە پیرۆز بوون سوێندیان بەو بتە بێگیانانە دەخوارد!! یان دەبینی کەسێکی هیندۆسی دکتۆرای هەیە کەچی بە غەریزەی خۆشویستنی پەرستراو مانگا دەپەرستێ!! مرۆڤی وا هەیە شەیتان دەپەرستێ و لەسەر شەیتان شەڕ دەکات!!

بەڵێ هیچ کەس نییە پەرستراوێکی نەبێ! ئیلحادییەکان ئیلحادو بێباوەڕییــان کردووە بە خوای خۆیان ئەی ئەوە نییە لە پێناویدا خۆیــان بە کوشــت دەدەن؟ قبوڵــی زیندانو ئەشــکەنجەی نەیاری بیروباوەڕەکەیان دەکەن.

پاشــان خۆشەویستی سەرکردەو چاوساغو ڕابەر کە بۆ ئیمانداران بریتییە لــە پێغەمبەران «علیهم الصلاة والســلام» بۆ بێدینانیش سەرکردە دونیاییەکانن.

هەروەهــا لەو غەریزانەی خۆشەویســتی نێوان دوو زیندەوەر بە هۆی ڕەحمو ســۆزو بەزەیی هاتنەوەیان بــە یەکتردا. بۆ نمونە: لە کەناڵێکی تەلەفیزیۆنی کوردی خۆماندا بینیم لە شارۆچکەی کەلار، گوێدرێژێك ســەیارە لێی دابوو بەچکەیەکی تازە لە دایکبووی لەدوا بەجێ مابوو ئەم جاشولکەیە کە شیری دەخواردو دایکەکەی لە ژیاندا نەمابوو، لە نزیکیەوە ســەگێك تازە چەنــد بەچکەی ببوو. لەگەڵ

توتەڵە سەگەکانی خۆیدا شیریشی دەدا بەم جاشولکە گوێدرێژەو خۆی بۆ پاڵ دەخەستو جاشولکەکەش بە ئیسراحەتی خۆی تا تێری دەخوارد لە شیر ئەو دێڵە سەگەی دەخوارد. پاشان ئەم سەگە هەروەکو چۆن یاریو گەمەی لەگەڵ بەچکەکانی خۆی دەکرد، ئاواش یاری لەگەڵ ئەم جاشولکە بێدایکە دەکردو وەکو بەچکەو دایك بە یەکەوە رەفتاریان دەکرد!! یاخود لە رۆژنامەی(کۆمەڵ)دا لە یەکێ لە ژمارەکانی مانگی دووی ساڵی (٢٠٠٩)دا خوێندمەوە کەلە شاری سلێمانی لە گەڕەکی (تاڤگە) ماڵێك کە حەوشەی خانوەکەیان گەورەیەو مریشکی خۆماڵی ڕاگرتوەو کەڵەشێرو مریشکی زۆری هەیەو مریشکەکان جوجەڵەیان هەیە، هەر لەو حەوشەیەدا پشیلەیەك بەچکە پشیلەیەك لەگەڵ خۆی دێنێت بۆ ئەم ماڵە، کە دیارە لەماڵ و جێگەیەکی تر ترەکیوەو بەچکەکانی تری فەوتاونو تەنها ئەم بەچکەیەی ماوەو رووی کردۆتە ئەم ماڵە. ڕۆژێکیان پشیلەکە دیار نامێنیو ئیتر ناگەڕێتەوە. لەوە دەچێ بەهەر هۆکارێك بووبێ فەوتابێ، ئەم بەچکە پشیلەیە بێ کەسوکار وسەرپەرشت دەمێنێتەوە. بەڵام (الله) کە خالیقو ڕازیقی هەموو شتێکەو کەس فەرامۆش ناکات. بە غەریزەی بەزەیی پێداهاتنەوەو ڕەحمو سۆز جوڵان دڵی کەڵەشێرێکی ئەو ماڵە بۆ ئەم بەچکە پشیلەیە نەرم دەکاتو ئەم بەچکە پشیلەش دەبێتە گوێڕایەڵێکی زۆر ملکەچو بەردەوام ئەم کەڵەشێرە هەرکە قوقەیەکی بۆ کرد ئەم بەچکە پشیلە




دەکاتە بەردەمی‌و ئەویش دەیباتە لای مریشكو جوجەڵەکانو لەگەڵ ئەوان ئەو چێشـــتو خواردنو پاشـــماوەی خۆراکـــەی بۆیان دانراوە دەخواتو بەیانیان زوو ئەم بەچکە پشیلە دەچێتە بەردەم کولانەی کەڵەشێرو مریشـکەکانو چاوەڕێی هاتنە دەرەوەیان دەکاتو هەرکە هاتنە دەرەوە. کەڵەشێرەکە قوقەیەکی بۆ دەکاتو بەچکە پشیلەکەش بۆی دەمیاوێنێتو پاشان کەڵەشیرەکە دەنوك لەسەرو ملی پشیلەکە دەداتو بــۆی دەخورێنــی!! ئەم خاوەن ماڵە دەڵــێ: ئەوەی جێگەی ســەرنجە هەرکات ئــەم بەچکە پشـیلەیە دوور بکەوێتەوەو بڕواتە دەرەوەی حەوشــەو لەبەر چاو نەبێ. ئەم کەڵەشــێرە قوقەیەکی بۆ دەکاتو یەکسەر ئەم بەچکە پشیلە دەگاتە بەردەمی‌و ئەویش چەند جارێك بە دەوریا دەخولێتەوەو قوقە قوق دەکاتو وەکو ئەوەی پێی بڵێ: ئاوا بڕواو تۆ ئاوا دوربکەویتەوە ئەم سەرە سەری خۆت نابێ‌و وەکو دایکت تیا دەچی!!! دەی خۆ پشــیلەو مریشــكو کەڵەشــێر بە هۆی خواردنی جوجەڵەکان لە لایەن پشیلەوە نێوانیان خۆش نییە، بــەڵام لە کاتی لێقەومانو بێدەرەتانیدا ئــاوا غەریزەیان لە لایەنی سۆزو بەزەییەوە بۆ یەکتری دەجولێ، هەروەها لەو غەریزانەی کە خــوای پەروەردگار لەناو بەندەکانیــدا دای ناوە بۆ مانەوەی مرۆڤ بە ســەلامەتی‌و بەختەوەری بریتییە لە: خۆشەویستی دایكو باوك بــۆ منداڵ، کە چۆن دایكو باوك هەموو ژیانو ئیســراحەتی خۆیان دەکەن بە قوربانی ئەو کۆرپەیان. وە هەروەها خۆشەویســتی منداڵ




بۆ دایكو باوكی كە هیچ كەس ناتوانێ جێگای دایكوو باوك بۆ منال بگرێتەوە كە بەڕاستی ئەگەر ئەم غەریزە بەهێزە نەبوایە ڕەنگە كەس نەیتوانیایە منالێك بەخێوبكات، هەروەها لەو غەریزانەی كە خوای پەروەردگار لە ناو ناخی مرۆڤدا چەسپاندویەتی خۆشەویستی مرۆڤ بۆ ئەو خانوەی كە تێیدا دەژی پاشان بۆ ئەو شارەی كە تییدا دەژی یان لێی لەدایك بووی، بۆ نمونە ئەگەر خەلكی سلێمانی بی، كە چویتە بەغداد سۆزو خۆشەویستیت بۆ شارەكەی خۆت دەجولێو بە بینینی هەر هاوزمانێكی خۆت خۆشحالْ دەبیت، پاشان خۆشەویستی ولاتەكەت كە ئەوانەی لە دەرەوەی ولاتی خۆیان دەژین دەزانن نیشتمان چەند شیرینەو چەندە خۆشەویستە، دەبینین چەندین گوندو شوێنی نیشتەجێبونی هەیە زۆر ناخۆش‌و نەگونجاوە بۆ ژیان، بەلام لە لای دانیشتوانی ئەو شوێنە، خوای گەورە وای خۆشەویست كردوە كە بە لایانەوە خۆشترین جێگای سەرزەویە، كە ئەگەر ئەم غەریزەیە نەبوایە هەرگیز سەرزەوی ئاوەدان نەدەبۆوەو مرۆڤ لە هەموو شوێنێك نەیدەتوانی بژی!!

هەروەها لەو غەریزانەی كە خوای گەورە بە مرۆڤی بەخشیوە خۆشەویستی كارو پیشەكەی. مرۆڤ بە غەریزە ئەو پیشەیەی خۆش دەوێت كە هەلی بژاردوەو بژێوی ژیانی بەهۆیەوە دابین بوە. چەند پیشە هەیە لای تۆ زۆر ناخۆشە، كەچی بۆ خاوەن پیشەكە لەزەتێكی تایبەتی تێدایەو وا ئەزانێ پیشەكەی ئەو لە هەموو



پیشەیەك خۆشترە، كە ئەگەر ئەم غەریزەی خۆشەویستی بۆ پیشە نەبوایە زۆر ئیشوكار هەبوو پەكی دەكەوتو كەس ئەنجامی نەدەدا، سەرەنجام خەڵكی پەكیان دەكەوت!

غەریزەیەكی گرنگی تر كە خوای پەروەرگار بە مرۆڤی بەخشیوەو بابەتـــی وتارەكەی ئێمەیە، بریتییە لـــە غەریزەی جنسو ئارەزوی سێكسی حەڵاڵ، دوای ئەوەی مرۆڤ گەشەو نما دەكاتو دەگاتە نزیكەی پانزە ساڵان، غەریزەیەكی گەورەی تری تێدا دەردەكەوێ كە ئەویش غەریزەی جنسو سێكســـە. ئەم غەریزەیە جیاوازە لەگەڵ غەریزەی جنســـی لە ئاژەڵاندا، چونكە ئەگەر چی ئاژەڵیش غەریزەی جنسیو سێكســـی هەیە، بەڵام ئەگەر چی لەو كاتەدا هەندێ خۆشەویســـتیو هاوسۆزی لە نێوان ئەو نێرو مێی ئاژەڵ و باڵندەو كرمو خشۆكانەدا ڕوو دەدات، بەڵام لەواندا ئامانجی ئەم غەریزەی جنسیو مومارەسە سێكســـییە تەنها زۆربـــوونو نەفەوتانی ڕەگـــەزە. ئەوەتا نێرو مێی زۆربەی ئاژەڵ و باڵندەو خشـــۆكەكان لە ســـاڵێكدا تەنها یەك جارەو ئیتر كە مێیە كەوتە هێلكەكردن، یان بەچكەی چوە ســـكەوە ئیتر جووتبوون لەگەڵ نێرەدا ناكات.. بەڵام غەریزەی جنســـی و سێكسی لە مرۆڤدا دەبێ جیاواز بێت لە ئاژەڵ. واتە: نابێ هە تا ئەو كاتەی كە ئیشـــی جووتبونیان بـــە یەكەو ئارەزووەكانیـــان خاڵی دەكەنەوە یەكتریان خۆش بوێت. وە تەنها مەبەست لێی وەچەخستنەوە بێت، بەڵكو مەبەســـت لە غەریزەی ئارەزوە جنســـیەكان كەخوای گەورە









لــە هەردوو ڕەگەزی نێرومێدا دروســتی کــردوە، یەکێ لە ئامانجە گەورەکان لێی دڵ ئاسودەبوونو حەسانەوەیە لە پاڵ یەکترداو سۆزو خۆشەویســتی دروســتبوونە لە نێوانیاندا. پاشــانیش ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێ نەوەو وەچەش بکەوێتەوە بۆ درێژەدان بە ژیــان خوای گەورە لە قورئانــدا فەرمویەتی: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الروم :٢١

ئیمانداران: سەیری ئەم چەند وشە جوانو پڕمانایە بکەن:

﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ ﴾ کە تێمان دەگەیەنێ ئەم باســی خۆشەویســتی نێوان ڕەگەزی نێرومێ بۆ یەکتری و گەیشتنیان بە یەك بە حەلاڵی بە شەرعی خوا لە نیشانەو بەڵگەی دەسەڵاتی خوایە، کە ئەم دوو ڕەگــەزە مەیلی یەکتر دەکەن، هەمــوو ناڕەحەتیەکی ژیان و گرانی ژیانــی هاوســەری و ئەرکی منداڵ و پێگەیانــدن و پەروەردەکردن و بەخێوکردنیان دەگرنە ئەســتۆ. خوای گــەورە ئەو مەیلەی لە دڵی بەندەکانیدا ئاوا دروست کردوە.

کەوابــێ باســکردن لە خۆشەویســتی پاك و بێگــەردی نێوان کوڕ و کچ بە مەبەســتی پێکهێنانی ژیانی هاوســەری نەك هەر تاوان نییە لە ئیســلامدا، بەڵکو باســکردنە لە گەورەیی و دەســەڵاتی خوای گەورە و بەشێکی گەورەی دینە، بەشێکی هەرە گەورەی شەرع باسی نیکاح و ئەو بابەتانەیە کە هاوپەیوەستن بە نیکاح و پێکهێنانی ژیانی هاوسەرییەوە.





پاشان سەرنجی ئەم وشە ناسك و سەرنجڕاكێشانەی قورئان بدەن كە دەفەرموێ : ﴿خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا﴾ سەرەنجی ووشەی: ﴿أَنفُسِكُمْ﴾ بدەن بە مانای هاوسەرەكانتان لە خۆتانن، واتە ئەوانیش مرۆڤن، جالێردا موفەسیری قورئان زانای پایە بەرز «إبن كثير» دەفەرموێ: [ وَلَوْ أَنَّهُ تعالى جَعَلَ الأَناث مِنْ جِنْسٍ آخر، مِنْ جانٍ أَوْ حَيْوانٍ, لَمَا حَصَل هذا الإِئْتِلاف بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الأَزْواجِ ].

واتە: ئەگەر بهاتایە خوای گەورەو باڵادەست ڕەگەزی مێ -ئافرەتانی- لە جنسێكی تری غەیری مرۆڤ دروست بكردایە، لە جنۆكە یان ئاژەڵ، ئەوە هەرگیز ئەو پابەندی و دڵپێكرانەوە و خۆشەویستی و هاودەمییەی لەگەڵ مێردەكەیدا بۆ دروست نەدەبوو. پاشان هەر لە وشەی ﴿أَنفُسِكُمْ﴾ دەتوانین ئەوەش وەربگرین كە دەبێ پیاو چەندە خۆی خۆش دەوێ، ئەوەندەش هاوسەرەكەی خۆی خۆش بوێت، چونكە بەشێكە لە خۆی. ئایا كەسێك هەیە ڕقی لە بەشێك لە جەستەی خۆی بێت؟ لێی بدات.. یان بیبڕێت.. یان ئەشكەنجەی بدات...؟ هەموو كەس بە شێت و تێكچوی نازانن؟! دەی هەر كەسیش سوكایەتی بە خێزانی خۆی بكات و ئازاری بدات و لێی بدات، ئەوە هیچ جیاوازی نیە لەگەڵ ئەو شێتەی كە سوكایەتی بە جەستەی خۆی دەكات، چونكە خوا فەرمووی: ﴿مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾ هاوسەرەكانتان بەشێكن لە خۆتان.. پاشان سەرنجی وشەی: ﴿أَزْوَاجًا﴾ بدەن وشەی «زوج» بە مانای: هاوتاكەت «جووت»







واتە تۆ لاسەنگ و ناتەواویت بەبێ ڕەگەزی بەرامبەرت، بە نمونەی بارێك ئەگەر لایەكی پڕبێت و لایەكەی تری هیچی تێدا نەبێ خۆی ناگرێ و دەكەوێ، یان ئەگەر لایەكیان قورسترو لایەكیان سوكتر بێت دیسان ئەو بارە هەر سەنگین نابیت و دەكەوێ، چونكە هاوتاكان بە كەمبونی تایەكیان هاوتایی لە دەســـت دەدەن، بە هەمان شێوەش لە ژیانی هاوســـەریدا ئەگەر ژنو پیاو -مێرد- یەكیان ویستی خۆی بە گەورەترو قورسترو سەنگینتر بزانێت لە هاوسەرەكەی ئەوە تایەكی بارەكە لار دەبێ و سەرەنجام دەكەوێ و ناگاتە مەنزڵ. دەی هەموو ئەو كەس و ڕێكخراوانەی كە بانگەشـــەی ئەوە دەكەن كە ژنو پیاو دەبێ یەكســـان بن و پیاو ژن بە صفر دانەنێ و حیســـابی بۆ نەكات ئەو بانگەشـــەیەی ئێوە ئەوە قورئان بە یەك وشـــە، بەڵێ تەنها بە یەك وشە ﴿أَزْوَاجًا﴾ چەسپاندویەتی.

بەڵـــێ ئیماندارانی بەرێز ئەم غەریزە جنســـییەی نێوان نێرومێ بۆ یەكتر هەر لە سەرەتای پەیدابوونی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەویدا هاتۆتـــە مەیدان، ئەوەتا ئەو كاتەی كە باوكە (ئادەم) وەكو یەكەمین مرۆڤ دروست بوو، سەرەتا لە بەهەشتدا دەژیا، ئیتر وشەی (بەهەشت) هەرچی خۆشـــی و لەزەت و تام و چێژە و مرۆڤ بۆی عەودالەو بە دوایا وێڵەو هەوڵی بۆ دەدات بە بێ ماندووبون، لەوێدا ئامادەیە، كە وتت (بەهەشـــت) واتای كۆكەرەوەی هەرچی خێرو خۆشـــی هەیە كە مرۆڤ بە خەیاڵیشـــیدا نەهاتووە! بەڵێ ئادەم لە بەهەشـــتدا بوو لە





هیچی کەم نەبوو هەرچی دڵی بیخوازێ بە ئامادەکراوی لە بەردەمو دەستیا ئامادە بوو. کەچی ئادەم لەم بەهەشتەدا هەستی بە تەنهایی‌و بێتاقەتی دەکرد. پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: (إستَوْحَش آدَم) بەواتایەکی تـر: سـەرەڕای ئەوەی کە ئادەم لە بەهەشـتا دەژیـاو لەهیچی کەم نەبوو، بەڵام هەستی دەکرد لەشتێکی کەمە. هەستی بە بۆشایی یەك دەکرد کە ئەم پێوسـتی پێیەتی‌و ئـەو کەلێنەی پڕنەبۆتەوە، بەڵام ئادەم نازانێ ئەم شـتە چی یە؟. بۆیـە کاتێ ئادەم خەوی لێ کەوت لەکاتـی خەودا لەپەراسـوی چەپی ئادەم کەسـێکی تر مرۆڤێکی تر دروستکرا بەڵام مێینەبوو. ئەویش دایکە – حەوا – بوو.

پێغەمبەری خـوا (ﷺ) لەبارەی دایکە حەواوە دەفەرموێ: (خُلقَتْ مِنْ ضَلعِ أعْوَج). لە پەراسـوی لار دروست بوو... بەڵێ (حەوا) جوانترین ئافرەتی سـەرزەوی بـووە، دوای ئەویش سـارای خێزانی حەزرەتی ئیبراهیـم زۆر جوان بووە، ئـەم دوو ژنە جوانترین ئافرەتی دونیا بوون، جا لێرەدا چەند سەرنجێك هەیە:

١- بۆچـی حەوا لە پەراسـوی چەپی ئادەم دروسـت بوو؟! ئەی بۆچی لە پەراسوی لای ڕاسـتی دروست نەبوو؟! بێدینەکان دەڵێن: ئەمـە کەمنرخی ئافرەتە، بەڵام نەخێر وا نیە، چونکە پەراسـووی سـنگی مرۆڤ هەردوو بەشـە گرنگەکەی ژیانی مرۆڤی پاراسـتوە ئەوانیش (بەشـیکی سـیەکان و دڵە) کە مرۆڤ یەك خولەك بە بێ ئـەو دووانە ناژی، خۆ ئەگەر مرۆڤ سـێ چـوار خولەکێك بە بێ





هەناسە بژی ئەوا یەك خولەك ناتوانێ بەبێ دڵ بژی. کەواتە: دڵ گەورەترین ئەندامە لە لاشەی مرۆڤدا، وە دڵیش لە لای چەپەوەیە کەواتە: پەراسوی لای چەپ زۆر گرنگو بەنرخە، چونکە ژیانی مرۆڤی پێ دەپارێزرێت کە دڵە. کەواتە: زۆر وشەیەکی جوانە کوڕ بە دەزگیرانەکەی یان پیاو بە ژنەکەی بڵێ: (دڵو هەناسەکەم). ئەمە وشەیەکی ئاینی ئیسلامە! کەواتە: ڕەگەزی نێر هەرگیز هەناسەیەکی خۆشی هەڵنامژێ و دڵی ئارام نابێ ئەگەر ڕەگەزی مێینەی لەگەڵ نەبێ، بەم شێوەیە ئیسلام ڕێزی لە ئافرەت گرتووە.

٢- بۆچی لە کاتی خەودا حەوای لێ دروست بوو؟... ئەی بۆچی لە کاتی بەئاگاییدا لێی دروست نەکراوە؟!... لە وەڵامدا: (والله تعالى أعلم) بۆ ئەوەی ئادەم هەست بە ئازاری دروستبوونی (حەوا) نەکات، دواتر پێی بڵێ من بە هۆی تۆوە ئازارم چەشتوەو بە چاوێکی ڕقەوە تەماشای بکات، بەڵام ئافرەت کە منالی دەبێت بە ئاگایەو هەست بە ئازاری منالبوون دەکات، زانایان دەڵێن: چونکە هەستو سۆزی(حەوا) زۆر لە هەستو سۆزی ئادەم بەهێزترە ئافرەت بێزار نابێت لە منالبوون و گوێش بە ئازارەکانی نادات، بەڵام ئادەم بەرگەی ئەو ئازارەی نەدەگرت هەر بۆیە لە کاتی خەوتندا (حەوا) لە پەراسوی ئادەم دروست کرا.

٣- بۆچی (ئادەم) لەخۆڵ -گڵ- دروست بووەو (حەوا) لە پەراسوو دروست بووە؟ واتە: لە شتێکی زیندوو دروست بووە؟ چونکە: ڕەگەزی نێرینە کاتێ لە دونیادا مامەڵەو هەڵسوکەوتەکانی ئەنجام دەدات







ئەگــەر بازرگان یان کرێکار یان جەنگاوەر یان جووتیار بێت لەگەڵ هەمان ئەو مادەیەدا تەعامول و هەڵسوکەوت دەکات کە لێی دروست بــووە تەعامــول لەگەڵ زەوی دەکات، بــەڵام ڕەگەزی مێ بە زۆری تەعامول لەگەڵ شتە ڕوحیەکاندا دەکات ئەرکی پەروەردەکردنی لە ئەســتۆدایە ئەرکی وەچەخســتنەوەو لەدایکبوون. کەواتە ئەرکیکی زیندووی لە ئەسۆیدایە، بۆیە (حەوا) لە شتی زیندوو دروست کرا... پرسیارێکی تر کە دەکرێ ئەوەیە: بۆچی ناونرا (حەوا)؟! لە وەڵامدا دەڵێین: (حەواء) سێ مانای هەیە:

١- (حیــاة) واتــە: ژیان، بە مانــای ئەگەر ئافــرەت نەبێت ژیان ئەستەمەو نابێت.

٢- بە مانای (حیاء) واتە شەرم و شکۆ دێت.

٣- بــە مانــای (ئیحتیوا) دێــت، لە ئامێزگرتنو لە باوەشــگرتن، ئەوەتــا باوەشــی ئافرەت ئامێزە بۆ مێردەکەی، بــۆ منداڵەکانی، ئایا هیــچ کات پیاو دەتوانێ ئاوا منداڵ لــە ئامێزی خۆیدا بحەوێنێتەوە کە ئافرەت پێی دەحەوێتەوە؟ نەخێر بەم جۆرە لەم مانای وشەی: (حەواء) تێ دەگەین کە: ئافرەتی بەڕێزو ســەنگین کە دەبێتە مانای خۆشــیو حەســانەوە بۆ مێردەکەی ئافرەتی نەجیــب و ئەصڵزادە ئەوەیە کە وەکو دایکە حەوای بێت و ئەم سێ سیفەتەی تێدا بێ:

١- ژیاندۆست بێ، نەك ڕقی لە ژیان بێو بە بچوکترین ناخۆشی لە ژیان بێزار ببێ. هەرکە قســەیەکی پێ وترا یان شــتێکی بە دڵ





نەبوو یەکسەر پەنا بۆ خۆسوتاندن ببات!.

٢- ئافرەتی ئەصڵزادە کە چووبێتەوە سەر دایە گەورەی خۆی کە دایکە حەوایە، ئەو ئافرەتەیە کە خاوەنی حەیاو حورمەتو شـەرم بێ، بەڵام بە داخەوە ئەمڕۆ بانگەشەی ڕووتیو بێشەرمیو سوڕدانی ئافرەت دەکرێ بە ناوی ئازادی ئافرەتەوە!!

٣- ئافرەتی سەنگینو بەڕێز ئەو ئافرەتەیە کە بەردەوام ئامێزی کراوەبـێ بۆ مێردەکەیو هەرکە لە دەرەوە بـە ماندویەتی هاتەوە ئامێـزی بۆ بگرێتەوەو بی حەسـێنێتەوە، ئای چەند جێگەی داخە ئەمڕۆ کەسان و ڕێکخراوێك هەن کە باسی (پیاوسالاری) و (مێردسالاری) دەکـەنو وا ڕاگەدەیەنن کە ژنو پیـاو دوو نەیارو ناحەزو دوژمنی یەکترن و پیاو خۆی فەرزکردوە بەسەر ژنداو دەبێ ژن خۆی ئازاد بکات و هەوڵ بدات کە تۆڵە لە پیاو بکاتەوە، بەم جۆرە لە بەرامبەر (پیاوسالاری)دا کە ئیسلام بە هەموو شێوەیەك ڕەفزی کردوە ئەوان (ژنسالاری) دروست دەکەن، ئەمانە هەموو هاتو هاواریان بۆ ئەوەیە کە با ژن ڕێز لە مێردی نەگرێ، خۆ ژن کۆیلە نییە، با ژن کاربکات بۆ ئەوەی وەکو مێردەکەی بە یەکەوە بچنە سـەر کار و بەیەکەوە بـە ماندویەتی بگەڕێنەوە بۆ مـاڵ، مناڵ بۆ دایك بە خێوی بکات؟ بـا لـە دایەنگە بەپارە بەخێو بکرێ!!. بەڵـێ ئەمڕۆ بە ناوی مافی ئافرەتـەوە هەوڵ دەدرێ ئافرەت لەم سـێ ڕەوشـتە ئەصڵەی دایکە حەوای خۆی بێبەش بکرێ، دەی ئافرەتان بە ئاگا بن..





بەڕێزان: وشـەی دووەم لە ئایەتەکەدا ئەوەیـە کە خوا دەفەرموێ: ﴿لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا﴾. بـە ماڵ و خانـوو دەوترێ (سـوکنا) چونکە هەتا خانوی خۆت نەبێو لەماڵ و حاڵی خۆتدا ئیسـراحەت نەکەی هەسـت بـە ئارامی دڵ و دەروون ناکەیت، وە مرۆڤ لە هەر جێگایەکی خۆش‌و دلگیـردا بێـت لە هیچی کـەم نەبێت، بەڵام هەتا نەیەتـەوە ناوماڵ و مەنزڵـی خۆی ئیسـراحەت ناکات، بەم شـێوەیە خوای گەورە وشـەی (سـوکنا)ی بەکار هێناوەو تێمان دەگەیەنێ (ڕەگەزی نێرو مێ) هەتا بە حەڵاڵی بەیەك نەگەن و ژیانی هاوسـەری پێك نەهێنن ئارام ناگرن و ناحەسـێنەوە، بەڵێ کـچ و کوڕ بەردەوام لە دڵەڕاوکـوێو نائارامیدان، هەریەکەیـان بە دوای هاوسـەری داهاتوی ژیانیـدا وێڵەو کچ چەندین کوڕ کە دێنە داواکاری، نازانێ کامیان هەڵبژێرێت، یان کوڕ لەو کچانەی کـە دەیانبێنێو نیـازی هاوسـەرگیری هەیە لەگەڵیـان نازانێ کامیان هەڵبژێرێـت، بەڵام کە گەیشـتن بـە یەکتری و بە حەڵاڵـی و حەیاو حورمەتـەوە مـارە کران لە یەکتری، ئیتر ئـارام دەگرن‌و لە دڵەڕاوکێ ڕزگاریان دەبێت.

ئەوەتا کاتێ ئادەم لە خەو هەسـتا ئافرەتێکی لە تەنیشتەوە بوو لێـی پرسـی: تۆ کێی؟ فەرموی: من حەوام ئـادەم فەرمووی: ئەی کاری تۆ چییە لەگەڵ من؟ حەوا فەرموی: (لِتَسكُنَ إلَيَّ) واتە: من دەبم بـە مایەی ئیسـراحەت و پشـوو بۆ تۆو بە یەکـەوە خێزانێك پێك دەهێنیـن... ئەمڕۆش چـی تێدایە ئەگەر کچێکـی ئیماندارو خاوەن





ڕەوشــت بە گەنجێکــی ڕێکوپێکی ئیماندارو ڕەوشــت بەرزی هاوتای خــۆی بڵێــت: من و تۆ بــۆ یەکتری دەگونجێین و حــەز دەکەم بە یەکەوە ژیانی هاوســەری دروســت بکەیــن‌و بەڕێکوپێکی‌و بە قەدرو حورمەتــەوە بێیتــە خوازبێنیم، خۆ ئەگــەر کوڕێکیش بە کچێك وا بڵێ ئاســاییە ئەمە ئیســلامەکەی ئێمەیە کە باسی ئەوەی تێدایە کە یەکەم جار ڕەگەزی مێینە داوای خۆشەویستی و بە یەکەوە ژیانی لە ڕەگــەزی نێرینە کردوە کچ داوای لە کوڕ کردوە!!.. بەڵام ئایا هەموو کوڕێــك بە کەڵکــی ئەوە دێت کە کــچ ئاوا دڵی خۆی بــۆ بکاتەوەو خۆی پێشــکەش بکات؟! لە وەڵامدا دەڵێیــن: بێگومان نەخێر بەڵکو کاتێك ئەو کوڕە شیاوی ئەوەیە کە کچ هەستو سۆزی پاکی خۆی بۆ دەرببڕێ کە ئەو کوڕە ئەصڵزادە بێ، چووبێتەوە ســەر باوکە ئادەمی وەکــو باوکــە ئادەم بە وەفا بێ، ئەوە بــوو کاتێ کە ئادەم‌و حەوا لە بەهەشــتەوە خرانە ســەر زەوی ئادەم لە هیندستان کەوتە خوارەوە حەواش لە(جدە)ی ســعودیە لەوانەشە ناوی شــاری (جدە)ی سعودیە هــەر لەوەوە هاتبــێ واتە: (دایە گــەورەی نەوەی ئــادەم)، ئەوە بوو ئادەم‌وحەوا لە لای کێوی عەرەفات بەیەك شــادبوونەوە، جا ســەیری خۆشەویستی ئادەم‌و وەفاداریەکەی بکە بۆ حەوای هاوژین‌و هاوسەری، بەردەوام و بێ وەستان وێڵی دوای حەوا بووە، تاوەکو دۆزیویەتیەوە.

لە هیندســتانەوە بە هــەزاران کیلۆمەتری بڕیوەو هاتوە بۆ خاکی عەرەفات لە سعودیە!! بە پێ ئەو هەموو ماوەی بڕیوە شوێن شوێن بە





وردی گەڕاوە بە دوای هاوســەرە خۆشەویستەکەیدا کە حەوایە، بەڵێ ئەگەر کوڕ بە راســتگۆیی نەوەی ئادەم بێ ئەوە شــایانی ئەوەیە کە کچ خۆشەویســتی خۆی بۆ دەرببڕێ، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ بانگەشەی بۆ دەکرێ و ئیســلام دژیەتی ئەوەیە: کوڕەکە نەوەی ئادەمی واز لێ هێنابــێ و خــۆی بەرێتە نەوەی مەیمون و پشــیلەوە، هەر تا حەزو ئــارەزوی خــۆی پێ تێــر دەکات، ئیتر دوایی وازی لــێ دێنێ، چەند ئافرەتی بەڕێزو پاك و ڕەوشتبەرزمان بینی کە مێردەکەی نەك هەر بە دوایا وێڵ نەبوو، بەڵکو بەجێی هیشتوە ڕۆیشتوە بۆ دەرەوەی وڵاتو ژنو کۆمەڵێ منالی بە تەنها بەجێ هێشــتوە، هەیانە هەر ئاوڕیشــی لێ ناداتەوە!! ئەمڕۆ فیلمکارتۆنی خۆشەویســتی هەیە خۆشەویســتی نێوان پشــیلەی نێرو مێ، نێوان کەڵەشــێرو مریشك!!. جا ئایا ئەگەر کوڕو کچێك وەکو پشــیلەو کەڵەشێرو مریشك یەکتریان خۆش بوێت و هــەر میاومیاوێــنو گارەگاڕ لــە دەوری یەکتری بکــەن، ئایا ئەوە خۆشەویستییە؟! ئایا گوناح نییە ناوی خۆشەویستی لێ بنرێ؟

بەڵــێ ئیمانــداران: وتمان خۆشەویســتی غەریزەیەکــەو خوای گەورە لە مرۆڤدا دروســتی کردوە، بەڵام خۆشەویســتی جیاوازە لە هەوەسبازی و دەســتپێکەرمکردنەوەو پێڕابواردن!! بۆیە دەچینەوە خزمــەت قورئان ئەو قورئانــەی کە وەڵامی هەموو پرســیارەکانی تێدایــە ئایەتەکــە فەرمــوی: ﴿وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾ جابزانن ﴿مَّوَدَّةً﴾ لە (محبە) خۆشەویســتی گەورەترە، کوڕو کچ کە





سەرەتا یەکتریان ناسیو نیازی ئەوەیان لە دڵدا دروست بوو کە ژیانی هاوسەری بە یەکەوە پێك بێنن، بەڵام کاتێ بوونە هاوسەری حەلاڵی یەکتری ئەوکاتە ئەو (مَحبّه) دەبێ بە ﴿مَوَدَّةً﴾. پاشان ﴿مَوَدَّةً﴾ بۆ سەرەتای بەیەکگەیشتن و قوناغی گەنجیو لاویەتی، ﴿وَرَحْمَةً﴾ بۆ کاتی پیریو بەساڵاچوویی بۆ کاتێ کە نەخۆشی.. هەژاری.. لێقەوماوی.. دەربەدەری.. یەخەی ئەم ژنو مێردە دەگرێ، ئا لەم کاتە تەنگانەو ناڕەحەتەدا هەریەك لەو ژنومێردە پشت لە هاوژینەکەیو هاوسەرەکەی نەکات، بەڵکو پشتی بگرێو هاوسۆزی بێ، جا لێرەدا پێویستە ئەوە ڕوون بکەینەوە کە: ﴿وَرَحْمَةً﴾ مانای هاوسۆزییە نەك بەزەیی پێداهاتنەوە. ژنومێردی خۆشەویستی یەکتری نابێ کە بەزەییان بە یەکتردا بێتەوە، بەڵکو دەبێ لەوە گەورەتر بن، یەکتریو هاوسۆزی یەکتری بن.

ئیمانداران: ژیانی پێغەمبەران پڕیەتی لە مەوەدەو ڕەحمە لە ژیانی هاوسەریاندا. وەرن سەیری ژیانی دوو خۆشەویستی جوان و دڵگیر بکەن کە ئەوانیش: (ئیبڕاهیم پێغەمبەرو سارا خاتوونی هاوسەریەتی)، ئیبراهیم سەلامی خوای لێ بێت ئەوەندە (سارا)ی هاوسەری خۆش دەویست کە ماوەی نزیکەی (٨٠) ساڵ بێ منداڵبوون، هیچ منداڵیان نەبوو، کەچی لەماوەی ئەو (٨٠) ساڵەدا، ڕۆژێك لە ڕۆژان ئیبراهیم نەیویست ئازاری هەستو سۆزی خۆشەویستەکەی بداتو باسی ژنهێنانێکی تری نەکرد بە مەبەستی منداڵبوون! کەچی ئەمڕۆ






ئەوانەی بە ناوی خۆشەویستییەوە بە یەك دەگەن، ئەگەر سێ چوار ساڵێك دوای هاوسەرگیریان منداڵیان نەبێ، ئەوا ئەگەر پیاوەکە ژنیش نەهێنێ، مێشکی ژنەکەی کون دەکات بۆ منداڵبوون، بەڵام ئیبراهیم بە کردەوە بە سارای وت: ئەو هەموو حەزەی کە هەمە بۆ منداڵ و حەز دەکەم کۆرپەیەکم لە باوەش بگرمو گوێم لە وشەی -بابە- بێت، بەڵام هەمووی قوربانی تۆ دەکەم، دواتریش کە بە زۆری زۆرداریو تەکلیفی یەکجار زۆری سارا خاتوون ئیبراهیم (هاجەرە)ی مارە کردو (ئیسماعیل) لەدایك بوو، لە هەندێ نوسراوی مێژوییدا دەڵێ: سارا خاتوون غیرەی لە هاجەرە کرد ئەمەش سروشتی ئافرەتانە، سارا داوای کرد نابێ هاجەرەو منداڵەکەی لێرە بمێنن و نابێ لەگەڵمان بژین بۆیە ئیبراهیم ڕەزامەندی لەسەر ئەم بۆچونەی سارا نواندو هاجەرەو ئیسماعیلی شیرەخۆرەی تاقەنەی کە بەقەدەر هەردوو چاوی خۆی خۆشی دەویست هەڵی گرتنو بەفەرمانی پەروەردگار بردنی بۆ جێگایەکی زۆر دوور لە فەلەستین و بردنی بۆ حیجاز ئەمەش هەمووی لە پێناو وەفاداری و ڕازیکردنی دڵی هاوسەرەکەی (سارا خاتوون) لەوەش زیاتر بۆی سەلماند کە ئەی (سارا) ئێمە ئەوەندە خۆشەویستیەکەمان بەهێزە بە نەبونی منداڵ لە تۆ و منداڵبوونی هاجەرەی هەڵبژاردی خۆت و پەیدابونی ئیسماعیلی کۆرپەی چاوگەشی خۆشەویستی لە بەردڵان هەرگیز خۆشەویستی نێوان منو تۆ کاڵ نابێتەوە، ئەوە تا بڕیار دەدەم ئەوان بەجێ بهێڵم و بێم



لەگەڵ تۆ بژیم!.. بەڵام ئەوە ئەگەر ئەمڕۆ بوایە دوای پەیدابوونی منداڵ لە ژنی دووهەم دوای ئەو هەموو ساڵ بێ منداڵییە، ئەوە ژنی یەکەم یان دەبوو ببێتەوە خزمەتکاری ژنی دووهەم و کۆرپەکەی، یان دەریان دەکرد بۆ ماڵی باوانی، یان ئەوپەڕی خانویەکی سەربەخۆی بۆ دروست دەکراو مانگەومانگ یان جەژناوجەژن سەری لێ دەدا!!.

ئایا ئەوانەی کە بۆ مەبەستی منداڵبوون ژنی دووهەم دەهێنن و پاشان کە منداڵیان بوو ژنی یەکەمیان سەرگەردان دەکەن ئەگەر هەر ناوێکی ئاینیان لەسەر بێ لە (شێخو حاجیو مەلاو فلانو فلان) ئایا ئەم کەسانە لەسەر ئیسلام حیساب دەکرێن؟! بێگومان نەخێر. چونکە ئەگەر موسڵمانی تێگەیشتوو بوایە وەکو ئیبراهیمی دەکرد!

ئیماندارانی بەڕێز: لەماڵی پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی خودای لەسەر)ەوە دەگوازینەوە بۆ ماڵی خاتەمی پیغەمبەران و نیردراوان حەزرەتی فەخری عالەم (ﷺ). بابزانین ئەم خۆشەویستە چۆن ڕێزی لە خێزانەکانی گرتووە، چۆن خۆشەویستییەکی دەگمەن لە نێوان خۆی و خێزانە بەڕێزەکانیدا هەبووە. بۆ نموونە: خۆشەویستی پێغەمبەری خوا بۆ خاتوو عائیشە: سەرکردەی سەربازی بەناوبانگ (عەمری کوڕی عاص) لە جەنگی [ذات السلاسل] گەڕایەوە بە سەرکەوتنێکی گەورەوە. جا عەمر چونکە پێشتر زۆر دژایەتی ئیسلامی کردبوو ویستی لەم دەرفەتدا لە بەردەم هەموو فەرماندە سەربازیو سەرلەشکرەکاندا خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ لای خۆی





مسوگەر بکات، بۆیە ئەم هەلەی قوستەوەو عەرزی پێغەمبەری خوای کرد: ئایا خۆشەویسترین کەس لە لای تۆ لەناو دڵی تۆدا کێیە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: عائیشە.

بەڕێزەکەم: ئایا ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەوەت لە کەسێ پرسیوە کە خۆشەویسترین کەست کێیەو بێ هیچ دوودڵیو بیرکردنەوەو وەستانێك یەکسەر وەڵامت بداتەوەو پێت بڵێ: هاوسەرەکەم!! بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو کاتەدا کە باس باسی سەرکەوتنی جەنگەو گەورە ئەفسەرو فەرماندە ناودارەکانی لە خزمەتتدان یەکسەر دەڵێ: عائیشە. جا سەرنج بدەن نەیفەرموو ژنەکەم هاوسەرەکەم بەڵکو یەکسەر فەرمووی عائیشە ناوی هێنا... ئێستاش زۆر پیاو هەیە لە ناو موسڵماناندا تەنانەت لە ناو بانگخوازو کەسایەتیە ئاینییەکانی ئیسلامیشدا کە لە ناو کۆمەڵی خەڵکی زۆرو لە بەردەم گەورە پیاوان و چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەنوسی و ناو بیرەوەریەکانی خۆیدا بێ هیچ دوودڵیەك لە جیاتی بڵێ: خێزانەکەم ناوی هاوسەرەکەی بە شانازیەوە بێنێ!

ئەمجا لەمەش سەرنجڕاکێشتر ئەوە بوو کاتێ عەمر پرسیاری کردەوە: قوربان من مەبەستم لە پیاوانە، لە ناو پیاواندا کێت زۆر خۆش دەوێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەمجارەش بەبێ هیچ وەستان و دوودڵییەك یەکسەر فەرموی: (أبوها). باوکی عائیشە تەماشا کەن نەیفەرموو (ئەبوبکر) بەڵکو فەرموی: باوکی عائیشە، بۆ ئەوەی پێیان بڵێ: ئەی خەڵکینە ئەی گەورە پیاوانی صەحابە بەشاهید بن



من ئەوەندەم عائیشـــەی هاوسەرم خۆش دەوێت بە هۆی عائیشەوە هەموو کەسوکارەکەیشـیم خۆش دەوێ، حەز دەکات لە جیاتی بڵێ: خەزورم. بڵێ: باوکی عائیشـــەی خێزانم کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئـــەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەندە عائیشـــەی خۆش ویســـتوە لەزەت و خۆشی لەناو هێنانەکەشی بینیوە...

نمونەیەکی تر لە خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ هاوسەری ژیانی، خۆشەویســـتی بۆ خاتوو (صەفیـــە)ی خێزانی کە ئافرەتێکی بـــاڵا کورت بووە. جارێکیان کە دەیەوێت ســـواری پشـــتی ئەســـپێك ببـــێ هەرچەند دەکات قاچی ناگاتە ئەو شـــوێنەی کە ئاوزەنگەکەی پێوەیە و لە کاتی ســـەرکەوتندا قاچی دەخرێتە سەر، چونکە باڵای کورت بوو قاچی نەی دەگەیشتێ، لەم کاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەندەی خاتوو (صەفیە) خۆش ویستووە و ئەوەندە لە دڵیا شیرین بووە حەزی نەکردوە هەســـت بە ناڕەحەتیەك و کەمیەك لە باڵای خۆیدا بکات و تەریق ببێتەوە لەبەر چاوی ئەو هەموو خەڵکە، بۆیە نەیفەرمـــوو ئادەی یارمەتی بدەن، یـــان ئادەی ئاوزەنگی وڵاخەکەی بۆ نزم بکەن، یان وڵاخی ســـواریەکە ببەن بۆ لای بەردێکی گەورەو با لەوێوە سەرکەوێ، چونکە هەریەك لەم شێوازانە کەم و کورتیەك بـــۆ خاتـــوو صەفیە دەردەخـــات، هەر بۆیە پێغەمبـــەری خوا (ﷺ) خۆی گەیاندە لای خاتوو صەفیەو لە تەنیشـــت ئەسپی سواریەکەوە ئەژنۆی موبارەك و پیرۆزی خســـتە ســـەرزەوی، ئـــەو ئەژنۆیەی بە





هەزاران جار سوجدەی نوێژی پێ بردبوو، ئەو ئەژنۆیەی کە بە ئەژنۆی جوبریلی ئەمینیەوە نابوو!. ئەو ئەژنۆیەی خۆی خستە سەر زەویەکەو فەرمووو: (صەفیە گیان) وەرە قاچت بخەرە سەر ڕانم، سواری پشتی ولاخەکە ببە، پاشان خاتوو صەفیە قاچی خستە سەر ئەژنۆو ڕانی پێغەمبەری خواو پێغەمبەری خواش (ﷺ) هێواش هێواش خۆی بەرزکردەوە. تاوەکو خاتوو صەفیە چوە سەر پشتی ولاخەکە!! ئا ئەمەیە خۆشەویستی بۆ هاوسەری ژیان.

تو خوا من لێتان دەپرسم ئەی هەموو ئەو کەسانەی کە باسی (خۆشەویستی) دەکەنو وا ئەزانن یان وا تێ گەیەندراون، کە ئیسلام دژی خۆشەویستییە، هیچ سەرکردەیەکی ناوداری جیهانیتان بینیوە تا ئەم ڕادەیە خێزان و هاوسەری خۆی خۆش بوێ و نەك هەر بە قسە، بەڵکو بە کردەوە، ئاوا وەکو ئەم نمونەیە خۆشەویستی خۆی بۆ هاوسەری دەرببڕێ؟! بێگومان دەڵێین نەخێر، دەی وەرن دەست بە ڕێبازی ئەو خۆشەویستەوە بگرن کە (محمد)ە (ﷺ) بۆ ئەوەی فێری خۆشەویستی ببن..

[مَنْ يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ] اللهُمَّ آمين

**سەرچاوەکان:**


١- صفوة التفاسير. محمد علی الصابونی، ج٢ ص٤٧٥.

٢- ژیانی پێغەمبەران. خوێندنەوەیەکی نوێ، حاجی کاروان، ل٤٧.

٣- خۆشەویستی، عمروخالید. وەرگێڕانی: مەریوان عارف ل١٣ ل١٥.









# خۆشەویستی - بەشی دووەم

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه أجمعين:

هەر لەوکاتەوە کە مرۆڤ لە دایک دەبێت، کۆمەڵێ خوو خەسڵەتی تایبەت بە مرۆڤبوونی لە گەڵدایە و تا ئەوکاتەی لە دنیا دەردەچێ جیانابنەوە لێی و لە گەڵ بڕینی هەر قۆناغێکی ژیانی ئەو خاسیەتانەش لەگەڵیدا گەشە دەکەن و بەرەو کامڵبوون دەڕۆن یەکیك لەو خەسڵەتانە کە لەگەڵ مرۆڤدا لەدایك دەبن یان ڕوونتر بڵێین: خەسڵەتی نەفسانی و جیانەبووەوەیە لە مرۆڤ و لە ناخیدایە، بریتییە لە خەسڵەتی (خۆشەویستی و ئەڤین).

خۆشەویستی ئەو هێزەیە کە مرۆڤ بەرەو دڵنیایی و ئاسوودەیی و پەسەندی دەبات یان بە پێچەوانەوە بەرەو نەمانی ئارامی نادروستی دەبات، بۆیە ئەو ڕەهەندە بەهێزە ئەگەر مومارەسەی خۆشەویستی عەقلانی بوو، ئەوە پێی دەوترێ ڕەهەندی بەهێزو پەسەند، خۆ ئەگەر بە لای عاتیفەو سۆزو ئارەزووی برد ئەوە پێی دەوترێ








ڕەهەندی بێهێزو لاواز، بۆیە لێرەوە دەبێت بزانین کە خۆشەویستی عەقلانی کامەیە و خۆشەویستی سۆزو ئارەزوو کامەیە؟

خۆشەویستی عەقلانی.. ئەوەیە کە هەر هەنگاوێك بەو ئاراستەیەدا دەنێت بۆ چوونە ناو جیهانی ئەوی تر بێت، چونە ناو هەر جیهانێکیش واتە: کەشفکردنی تەواوی لایەنەکانی، ئەو کەشفکردنەش دەبێت بە جۆرێك بێت لە سروشتی ساغی مرۆڤدا جێی ببێتەوە، یاخود ئەوەیە کە خالیقی بونەوەر ئەم کەشفکردنەی لاپەسەند بێ و ئەم توانەوەی لە ڕەزامەندی پەروەردگاردا بێت. ئەمەیە هاوسەنگی تەواو، دەی خۆشەویستی یانی ئەو هاوسەنگیدانە بە مرۆڤ، ئەم هاوسەنگیدانەش تەنها ڕەهەندی بەهێزی ناخی مرۆڤە دەی بەخشێ بەو کەسە کە عەودالی ئەو کەشفکردنەیە. چونکە ئەم کەسە لە جیهانی ژیری و هۆشەوە تەماشای بونەوەرو سروشتی کردوە. هەر ئەم خۆشەویستیەشە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە بەشێ لە ئیمانی ڕاستەقینەی زانیوە و بە هۆکاری چوونە بەهەشتی هەژمارکردوە لە وەڵامی ئەو هاوەڵەدا کە پرسیاری کرد (کەی قیامەت دێ)؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: چیت بۆ ئامادە کردوە؟ وتی: خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (أَنتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ). یان لەڕیوایەتێکدا: (المرءُ مَعَ مَنْ أَحَب). ئەمەیە نهێنی خۆشەویستی لە ئیسلامدا، چونکە خاوەنی ئەم خۆشەویستییە پێوەری تەماشاکردنەکەی بۆ دەوروبەر عەقلانی





بووە، هەر ئەمەشە لای تەواوی مرۆڤە ویژدان زیندووەکان پەسەندە و خاوەنەکەی دەگەیەنێتە ناو بەهەشتی بەرین، ئیدی لێرەوەیە مرۆڤ دەگاتە لوتکەی کەماڵ، ئەو مەنزڵەی کە ویستراوە مرۆڤ پێ یبگات، هەر ئەم جۆرە خۆشەویستییەیە کە تەواوی زانایان بە ئەرکێکی شەرعی دەزانن و عارفی ئوممەتی ئیسلامیش (ئیبن قەییمی جەوزی) بە مەنزڵێك لە مەنزڵەکانی بەندایەتی هەژماری کردوە بۆ گەیشتن بە خواپەرستنێکی ڕاستەقینە، دەبێت لەم دەرگایەوە هەنگاو هەڵگری تا دەگەیتە حەقیقەت، بۆیە (خۆشەویستی دەرگای خواپەرستنێکی ڕاستەقینەیە لە ئیسلامدا).

خۆشەویستی دووەم/ خۆشەویستی عاتیفی و سۆزداری.. یا خود ڕەهەندی لاواز و ناپەسەند، ئەم جۆرە خۆشەویستییە لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە عەقڵ و هۆش پێوەر نییە لەم مەیدانەدا، خاوەنەکەی دەیەوێ لە ڕێگەیەکی ئاڵۆزو پڕ مەترسی هەنگاو هەڵگرێ کە مۆڵەتەکە لە سەرچاوەیەکی لاوازەوە سەرچاوەیەکی گرتووە، بۆیە هەمیشە خاوەنەکەی بەرەو هەڵدێرو دڵەڕاوکێ دەبات، دەیەوێ لێرەوە داخڵی جیهانی ئەویتر بێت، بەڵام لە ڕێگەیەکی لاوەکی و ناپەسەندەوە، چونکە ئاڕاستەی چۆنیەتییە نەفسانەییەکەی بەرەو ئارەزوو شەهەوات گرتووە، سەرەنجامەکەشی بەرەو جنسی جیاواز و نادروست دەڕوات، بەو هویەشەوە خۆشەویستی ڕاستەقینە نابینرێ لە نێوان دوو جنسی جیاواز، واتە: (لە نێوان کوڕ و کچدا) مەگەر





تەنها لە ڕێگەی هاوسەرگیری شەرعییەوە نەبێت، پێش هاوسەرگیری هەر شتێك کە ناوی خۆشەویستی بێت نییە، بگرە تەنها ناویان ناوە خۆشەویستی، ئەگینا ئەوە خۆخەڵەتاندنە و چەواشەکاریە، ڕوونتر بڵێین: تەنها سەرابێکەو هەر نزیکبوونەوەیەك لێی بەرەو خنکان و فەوتان ڕۆشتنە، خۆ سەرابیش هەر ئەوەیە کەسی تینوو وا دەزانێ بەرەو ئاوی حەیات هەنگاو دەنێ، بەڵام هەر هەنگاوێکی نزیکبوونەوەیە لە فەوتان و چەواشەکارێکی ڕوون، کەواتە خۆشەویستی پێش هاوسەرگیری هەر ئەم ناڕوونی و چەواشەکاریەیە کە لە ئیسلامدا قەدەغەیە، چونکە مومارەسەکردنێکی بێبنەمایە و تەمەن بە فیرودانە، چونکە تەمەن لە شتێکدا بەسەر دەبرێ کە نەدەبوو وا بێت، کەواتە هەر شتێك کە تەمەنی تیا بەسەر دەبرێت ئەگەر ئاراستەکەی ژیرانە و هۆشمەندانەو بەرەو هێزو ئارامی و بەختەوەری نەبوو ئەوە دەرخستنی لاوازی مرۆڤە کە ئارەزووەکان دەوریان داوە.

بەڵێ ئیماندارنی بەرێز: ئەم ژیانی سەرزەویە بە خۆشەویستی ڕاستەقینەوە چێژدارە، چونکە ژیانی دونیا بە ژانی لەدایکبوون دەست پێ دەکات، قیژەو هاواری لە دایکبوون پاشان بە گەنجیەتی بەخۆی و ئەو هەموو هێزو گوڕەی لاشەو نەفس و گەدەو حەزی پارەو پلەو پایەو ئارەزوی جنسی و خێزان و خانوو کە دەست ناکەوێ و فریای بە دەست هێنانی هەموی ناکەوێ کە پیری بەخۆی





و نەخۆشی و ناخۆشی و بێهێزی و لاوازییەوە دێت و ئەوکاتە (چاو نابینێ، گوێ ناژنەوێ، دانت نەما شیرت دەوێ). بەڵام ئەم ژیانە کە بۆ هەموو عەقڵمەندان ژانە، سەعدی شیرازی فەرمویەتی: (ئەوەی لەم دنیایەدا بێ خەمە مرۆڤ نییە).............

بەڵام ئەگەر بپرسین: باشە بۆچی دنیا پڕە لە خەم و ژان؟! لە وەڵامدا دەڵێین: چونکە تۆ لە سەر دونیا کاتیت و لە سەفەردایت ئەصڵەکەت و ماڵی راستەقینەت بەهەشتە. سەرەتا باوکە ئادەم و دایکە حەوا لە بەهەشت بوون، لەم سەرزەویە ئێمەی بەنی ئادەم سەفەرین و دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ماڵی حەقیقیمان کە بەهەشتە، بۆیە سەفەری ئەگەر لە هیچیشی کەم نەبێت هەر لە دڵەڕاوکێ و نائارامیدایە تا دەگاتەوە ماڵی خۆی. بەڵام لەگەڵ هەموو ناڕەحەتیەکانی ژیانیشدا مرۆڤ ئەگەر دەرونی سەلامەت بێ ژیانی سەر ئەم زەویەی هەر پێ خۆشە و حەزدەکات بژی، مرۆڤ حەزی بە ژیانی نەمرییە. ئایا نهێنی و سڕی ئەمە چییە کە ئەم ژیانە ناخۆشەمان هەر لا خۆشەو هەوڵی بۆ دەدەین و حەزدەکەین لە ژیاندا بین؟! لە وەڵامدا دەڵێین: بە هۆی بوونی چەند خۆشەویستییەکەوە مرۆڤ ژیانی لا جوان دەبێت تەنانەت ئەو مردنەشی پێ خۆشە کە لە پێناو ئەم خۆشەویستانەدا بۆی دەمرێت، چونکە دەزانێ مردنیش لە پێناو ئەم خۆشەویستانەدا هەر ژیانە، ئەی مەگەر خوای گەورە لە بارەی ئەو کەسانەوە کە لە پێناوی خۆشەویستی خوای گەورەدا روحیان






دەبەخشن و شەهید دەبن نافەرموێ: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴾. بەڵێ ﴿ بَلْ أَحْيَآءٌ ﴾ ئەوانە هەمیشە لە ژیاندان!. جا لەو خۆشەویستیانەی کە مرۆڤ بە هۆیانەوە بەختەوەرانە دەژی گەورەترینیان و بەرێزترینیان، بەڵکو سەرچاوەی هەموو خۆشەویستیەکان بریتییە لە (خۆشەویستی خوا- سبحانە وتعالی). خوای گەورە دەفەرموێ: [والذين آمنوا أشد حبا لله]. ئای چی تام و چێژێك هەیە لەم خۆشەویستییەی خودادا، هەرکەسێ نەیچەشتبێ نازانێ چۆنە ، هەر بۆیە پێغبەری خۆشەویستمان لە پاڕانەوەکانیدا لە حزوری پەروەردگاریدا دەیفەرموو: [اللهم ارزقني حبك، وحب من أحبك، وحب ما يقربني إلى حبك، واجعل حبك أحب إلي من الماء البارد] واتە: پەروەردگارا خۆشەویستی خۆتم پێ ببەخشی دڵم پڕ بێ لە خۆشەویستی تۆ وە دڵم پڕبێ لە خۆشەویستی هەرکەسێك کە تۆ خۆشت دەوێ وە هەر کردەوەیەك کە لە خۆشەویستی تۆ نزیکم دەکاتەوە خوا گیان ئەو کردەوەیەم لەلا خۆشەویست بکە وە ئەی خوای پەرومردگارم خۆشەویستی خۆت والێ بکە بۆم کە لە کاتێکی گەرمدا مرۆڤ چەند حەزی لە ئاوی ساردە زیاتر لەوە خۆشم بوێت... بەڵێ هەرکەسێ پەروەردگاری خۆی خۆش نەوێ کە سەرچاوەی بونیەتی و هەرچی خێرو خۆشی هەیە هەر ئەو پێی بەخشیوە ئەبێ ئیتر کێی بە ڕاستی خۆش بوێ؟! پاش خۆشەویستی خوای گەورە ئەمجا خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دێتە پێشەوە، کە پێغەمبەری



خوا فەرمویەتی: [ لا يُؤمِنُ أحَدُكُم حَتَّى أكُون أحَبَّ إلَيه مِن والِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أجمَعِين].
واتـــە: هیچ کەس لە ئێـــوە باوەڕی تەواو نابێ هەتـــا وای لێدێ کە منی بە لاوە خۆشەویستتر بێ لە دایك وباوکی و لە منالەکانی و لە هەموو خەڵکی بە گشـــتی... جا ئیماندارانی بەرێز: ئەم فەرموودەیە هانمـــان دەدات و پاڵمـــان پێـــوە دەنێ بۆ ئەوەی دڵمـــان پڕ ببێ لە خۆشەویســـتی بـــۆ دایك وباوکمـــان، دڵمان پڕ بێ لە خۆشەویســـتی بـــۆ نـــەوە و منالەکانمان وە دڵمان پڕ بێ لە خۆشەویســـتی هەموو خەڵكـــی، هەموو خەڵکیمان بە گشـــتی خۆش بـــوێ و ڕێزی هەموو کەس بگرین، چونکە مرۆڤە، چونکە هەتا ئێمەی موسڵمان لە ناخی دڵمانەوە دایك و باوکمان و نەوە و ڕۆڵەکانمان و تێکڕای خەڵکیمان خۆش نەوێ ناتوانین پێغەمبەری خوامان بەو ئەندازەی کە شـــیاوی خۆشەویســـتی ئەوە خۆش بوێت، چونکە گەر ســـەرنجی فەرمودەکە بدەن دەفەرموێ [حَتَّى أكُون أحَبَّ إلَيهِ]. تا منی زیاتر خۆش نەوێت لە... دەی یەکەمجار دەبێ خۆشەویســـتی دایك و باوك و منالْ و خەڵکی لە دڵتا ببێ، ئەمجا خۆشەویستی لەوە گەورەترت بۆ پێغەمبەر دەبێ چونکە وشـــەی [أحَبّ] دەبێ لە بەرامبەریدا وشەی [حُب] هەبێ دەی کەواتە: هەرکەســـی لە ناو خێزانێکی پڕ لە ئەوین و خۆشەویســـتی ژیـــان بەســـەر نەبات کە خێزان دایك و باوکـــە لەگەڵ نەوەو منالی خۆتە وە پاشان لە دەرەوەی خێزان خۆشەویستیت نەبێ بۆ هەموو خەڵکی بە گشـــتی ئەوەی ئیمانداره و کردەوەی چاکە بە تەعبیری





قورئـــان ﴿وَالَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾. لەبـــەر خاتری ئیمانداری و کردەوەی جوان و سودبەخشەکانی خۆشت بویٚ و ئەوەشی لاریٚ بوەو کردەوەی ناشیرین دەکات هەر خۆشت بویٚ و حەزنەکەی سەرگەردان بیٚ و هەوڵی ڕاســتکردنەوە و ڕیٚنمایی بدەیت و لە لیتاوی نەفامی و کردەوەی بەد دەری بیٚنی، ئەگەر ئاوا بە خۆشەویســتییەوە ژیای ئەوکات دەتوانی خۆشەویســتی ڕاســتەقینەت هەبیٚ بۆ پیٚغەمبەری (ﷺ) کە لە خۆشەویســتی هەموو کەس زیاتر بیٚ لە دڵتا.. پاشــان مرۆڤــی ئیمانــدار خۆشەویســتی ئیمان لــە دڵیدایە خــوای گەورە دەفەرمــووێ:﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ﴾ بەڵیٚ خوای گەورە ئیمان و بیروباوەڕی لە دڵی باوەڕدارندا خۆشەویســت کردوەو لە دڵ و دەرونتدا ڕازاوەو شیرینی کردووە.

ئیمانــداران: خۆشەویســتیەکی تــری مرۆڤــی ئیمانــدار بــۆ هاودینەکانیەتی، هەموو ئیماندارانی خۆش دەویٚت و لەوە ناپرســیٚ نــاوی چییەو چ نەتەوەیەکەو چ زمانیٚکــی هەیەو خەڵکی کویە وە ئەم خۆشەویســتنی ئیماندارانە پەیوستە بە ئیمانەوە. پیٚغەمبەری خــوا (ﷺ) فەرمویەتــی: [وَالَّذي نَفْسي بِيَدِهِ لا تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَـتَّى تُؤمِنُوا. وَلا تُؤمِنُوا حَتَّى تَحـابُّوا أولا أدُلُّكُم على شَيئٍ إذا فَعَلْتُمُوهُ تَحـابَبْتُم ؟ أفْشُوا السَّلامَ بَيْنَكُم]. واتە: سویٚند بەو کەســەی کە نەفس و گیانی منی بەدەســتە کە -الله-یە ناچنە بەهەشــتەوە هەتا ئیماندار نەبن وە ئیماندار نابن هەتا یەکتریتان خۆش نەویٚت، ئایا شتیٚکتان پیٚ بڵیٚم ئەگەر ئەنجامتان دا یەکتریتان

خۆش بوێت، سەلام لە ناو خۆتاندا بڵاوبکەنەوەو زۆر سڵاو لە یەکتری بکەن.... پاشـــان لە خۆشەویستیەکانی ئیماندار، خۆشەویستیەتی بۆ زێدو نیشـــتیمانی خۆی شوێنی لە دایکبوون و گەورەبون و گرۆگاڵ و تێگەیشـــتن و پێگەیشـــتن، پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) کاتێ کۆچـــی کرد لە مەککـــەوە بۆ مەدینە زۆر پـــەرۆش بوو بۆ مەککە کاتێ لە مەککە دەرچوو ئاوڕی بۆدایەوەو فەرمووی: ئەی مەککە تۆ خۆشەویســـترین خاکی ســـەرزەوی لە لای خوای گەورە خۆ ئەگەر قەوم و هۆزەکەم ناچاریان نەکردمایە کە بڕۆم و جێت بهێڵم ئەوە هەرگیز جێم نەدەهێشتی!! پاشان کە گەیشتە مەدینەش هەر هەست و سۆزی لای مەککە بوو، خۆ ئاشکرایە کە شاری مەدینە زۆر خۆشترو دڵگیرترەو بە داهاتترو تەڕو پاراوترە لە مەککە وە خەڵکەکەشی لە چاکترین و بەڕێزترین و بەخشـــندەترین خەڵکان بوون کە مێژوو بە شـــانازیەوە تۆماریـــان دەکات کە چی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر دڵی لای مەککە و شاری لەدایکبوونەکەی بوو وە صەحابەکانیشی بە هەمان شێوە بە پەرۆش بوون بۆ مەککە، ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خودای لێ بێت) لە تاوی مەککە تای لێ هاتبوو بە دەم تاوە قسەی دەکردو باســـی مەککەی دەکرد، بیلالی حەبەشـــی (ڕەزای خودای لێ بێت) کە ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەی لە مەککەدا بە بەندایەتی و سزاو ئازاری ئومەییەوە چەشتبوو، کەچی خۆزگەی بۆ شیوو دۆڵ و گژوگیا بۆنخۆشـــەکانی مەککە دەخوارد. ئا لەم کاتەدا پێغەمبەری




خـوا (ﷺ) ڕووی لــه پەروەردگاری کــردو فەرمووی: [اللهُمَّ حَبِّبْ إلَيْنـا المَدينَةَ كَحُبِّنـا لِمَكَّةَ أوْ أشَـدّ]. خوایه گیان مەدینەمان له لا خۆشەویسـت بکه و لەدڵماندا شــیرینی بکه وەکو خۆشەویستیمان بۆ مەککه یان زیاتریش لەوە.

بەڵێ بەڕێزان: ئەمە ئیســلامەکەی ئێمەیه که ســەرتاپای باسی خۆشەویســتییه. خۆشەویســتی خــوا، خۆشەویســتی پێغەمبــەر، خۆشەویستی ئیمان و عەقیدە. خۆشەویستی ئیمانداران ، خۆشەویستی نیشتیمان و زێدی لەدایکبوون، تەنانەت خۆشەویستی شاخیش هەیه له ئیســلامدا. هەموومان دەزانین که پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەندە توشی ئازارو ناڕەحەتی بوو له پاڵ شاخی ئوحوددا، چەند صەحابەی خۆشەویســتی شــەهیدکران، حەمزەی مامی لەوێ شــەهیدبوو، بۆ خــۆی بریندار بوو هەتا قیامەت شکســتی ئوحــود دەخوێنرێتەوە، موســڵمانان ئاخ و حەســرەت بۆ ئەو ساتە ســامناکانه هەڵدەکێشن، بــەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ)) که هەموو ژیانی خۆشەویســتی بوو سەیری ئەو شاخی ئوحودەی کردو تێی ڕاما صەحابەکان وایان زانی دەفەرموێ ئای ئوحود شاخێکی چەند شومی چەند ڕقم لێته چۆن به بیننت برینــم دەکولێتەوە، بەڵام به پێچەوانەوە زۆر به ئەڤین و خۆشەویســتییەوە سەیری کردو فەرمووی: [إنّ أُحُداً جَبَلٌ يُحِبُّنـا وَنُحِبُّهُ]. به ڕاســتی ئوحود شــاخێکه خۆشــی دەوێین و ئێمەش هەموومان خۆشمان دەوێ!!







بەڵــێ ئیمانــداران: یەکیکی تر لــە خۆشەویســتیەکان بریتییە لە خۆشەویســتی موســڵمان بۆ کەسانی دڵســۆز بە ئیسلام، بۆ ئەو کەســانەی ڕۆژێ لــە ڕۆژان بــە دڵ و بە گیان و بە ماڵ پشــتیوانی ئیسلامیان کردوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: [حُبُّ الأنصارِ مِنَ الإيمانِ] خۆشەویستی ئەنصاریەکانی مەدینە لە ئیمانەوەیە، بەم شێوەیە موسڵمان بەرامبەر بە کەسانی بەڕێزو بە خزمەت و مەردو خێرخوازو دەم و دەست بە خێر نەك حەسود نییە نەك حەزناکات لەناو بچن و ناویان نەبێ و نانیان نەبێ، بەڵکو هەموو ئەو کەســە بەڕێزو دەست بەخێرانەی خۆش دەوێت.

بەڵێ موسڵمان ژیانی پڕە لە خۆشەویستی. موسڵمان خۆی خۆش دەوێ، دایك و باوکی خۆش دەوێ، خوشــك و براو کەسوکاری خۆش دەوێ، سەرنج بدەن موسوڵمان هەریەك لە خزمانی ناوی تایبەتیان هەیە کە بەڵگەیە لەســەر خۆشەویستی بۆیان بە کوڕو کچی مامی دەڵــێ: (ئامــۆزا) بە کوڕو کچی پــوری دەڵێ: (پورزا) بــە نەوەکانی خاڵی دەڵێ: (خاڵۆزا) پاشــان ئەم وشــە جوانانە: (مــام.. خاڵ..پور.. نەنك.. دایەگــەورە.. باوەگەورە) کە هەمویان بە ناوهێنانیان مرۆڤ خۆشەویســتی هەســت پــێ دەکات.. ئەمجــا کە مرۆڤ لــە ناو ئەم هەموو خۆشەویســتیانەدا ژیا کەلێنیك لە خۆشەویستی دەمێنێتەوە کە بریتییە لە: خۆشەویســتی ڕەگەزی نێرو مێ بۆ یەکتری کە بە هاوســەرگیری شــەرعی ئەم خۆشەویســتیەش دێتە دی کە قورئان

دەفەرمـوێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾.

ئەم غەریزە بەهێزەی خۆشەویستی کوڕ بۆ کچ کەوا لە کوڕ دەکات هەموو مەشەقەت و ناڕەحەتی دونیا قبوڵ بکات، سەرماو گەرمای لێ بدرێ جۆرەها کاروکاسپی بکات شەو بێداری و مەترسی و دەربەدەری و غەریبی بچێژێ، چونکە دەڵێ پێویسـتیم بە هاوسـەرگیریە، بە تەمام ژن و منالّم هەبێ وە ئەم خۆشەویسـتییەی کچ بۆ کوڕ کەوا لـە کچ دەکات ئـەو هەموو ئازارو ماندویەتی شـەونخونی و ژانەی دایکایەتـی قبـوڵ بکات و نەك هەر بە ئـازار و ناڕەحەتی نەزانێ، بەڵکو تام و چێژیشی لێ وەربگرێ. بەڵێ هاوسەری، یانی هاوسەرینی بە مانای کوڕو کچ بە پەیماننامەی هاوسـەریەتی بەڵێن بە یەکتر دەدەن کە ئیتر ئێمە بە بێ یەکتری لەسـەر سـەرینی خەوتن ئارام ناگرین. ئێمە هاوژینی یەکترین ناخۆشترین بارودۆخی ژیان بۆمان خۆشییە، چونکە بە یەکەوە دەژین ئەی نابینی کچ یان کوڕ لە ماڵی باوکی لە ئەوپەڕی خۆشـی و تێروتەسەلی و خانوو ماڵی خۆشدایە، بەڵام کە دەچێتە ماڵی خۆیەوە و ژیانی هاوسـەری پێك دێنێ زۆر جار دەچێتە کرێچیەتی و کولانەخانوەوە و لە قەصرو قصورەوە بۆ ناو کوخ و بەناو خانوو، لە خواردنی خۆشـەوە بۆ نەبونی و چەند ژەم بە برسـیەتی سـەرنانەوە، کەچی وەرە لێی بپرسـە: ئێسـتات خۆشـترە یان کاتی ماڵی باوکت؟! ئەگەر شـەرم نەکات و ڕاشکاوانە



قسەی ناخی بکات دەڵێ: ئەم ژیانەی ئێستام خۆشترین ژیانە چونکە لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا دەژی....تەنانەت لە ئەڵقەی هاوسەریەتیدا مانای زۆرگەورە هەیە، کە سەرنج دەدەین ئەڵقەی هاوسەریەتی لە پەنجەی چوارەمی دەست دەکرێ ئەگەر پەنجە گەورە بە پەنجەی یەکەم و دۆشاومژە بەپەنجەی دووەم باڵابەرزە بە پەنجەی سێیەم بژمێردرێن ئەوا ئەڵقەی هاوسەریەتی دەکرێتە پەنجەی چوارەمەوە، باشە بۆچی دەکرێتە ئەو پەنجەوە؟! شیکردنەوەیەکی جوان هەیە بۆ ئەم بیرۆکەیە کەلە لای چینیە کۆنەکان بەم شێوەیە شی کراوەتەوە: پەنجە گەورە کە وتمان یەکەم پەنجەیە، دەوری دایك و باوك دەبینێت، دووەم پەنجە کە پەنجەی دۆشاو مژەیە دەوری خۆشك و برا دەبینێت، سێیەم پەنجە کە باڵابەرزەیە دەوری خۆت دەبینێت، چوارەم پەنجە کە ئەلقەی هاوسەریەتی تێ دەکرێ و پێی دەوترێ برای تووتە، دەوری هاوبەشی ژیان دەبینێت، پێنجەم پەنجەش کە پەنجە بچکۆلەیە پێی دەوترێ پەنجە تووتە دەوری مناڵ دەبینێت، جا ئێستا وەرە هەردوو دەستت بکەرەوە بیان نوسێنە بە یەکەوە وەکو چۆن چەپڵە لێ دەدەیت لەپی هەردوو دەستت بنوسێنە بەیەکەوە، ئێستا پەنجەی ناوەڕاست (پەنجەی باڵابەرزە) کە دەوری خۆت دەبینێت بنۆشێنەوە لە نیوەداو لەگەڵ پەنجەی بەرامبەریدا لە دەستەکەی ترت بیان نوسێنە بەیەکەوە، ئەوکات پشتی ئەو دوو پەنجەیەت لە ناوەڕاستەوە ئەنوسێن بە یەکەوە لەپی دەستت کەمێ






لەیـــەك دوور دەكەویتەوە، بەلام پەنجەكانی ترت هەر بە یەكەوەن بە كراوەیی... ئیستـــا ئەو دوو پەنجەیـــەی كە دەوری دایك و باوك دەبینـــن لیكیان دووربخەرەوە، تەماشـــا دەكەی زۆر بە ئاســـانی لە یەكتـــر دوور دەكەونەوە، بەلام بە بێ ئـــەوەی پەنجەی بالابەرزەت كە دەوری خۆت دەبینێ لە پەنجەكەی بەرامبەری ببیتەوە. چونكە باوك و دایك تاســـەر بۆ كەس نامینن و دەشـــتوانی لەگەڵ دایك و باوكیشـــت نەژی و لە شـــارو ولاتیكی تریش بێ و ژیانیشت ئاسایی بڕوات بەڕیوە... ئیستا هەوڵ بدە ئەو دوو پەنجەیەی دەوری خوشك و بـــرا ئەبینـــن لیكیان دوورخەیتـــەوە، ئەبینـــی ئەمانیش زۆر بە ئاســـانی لە یەكتر دوور ئەكەونەوەو، چونكە خوشـــك و براش لیك دوور ئەكەونـــەوەو هەریەكەی بە ئیشـــوكارو مـــاڵ و خیزانی خۆی دەكەویتە لایەك... ئەمجارە هەوڵی دورخســـتنەوەی ئەو پەنجانەت بـــدە كە دەوری منالەكانت دەبینـــن. كەپەنجە تووتەتە، ئەبینی بە هەمان شـــیوەی پیشوو ئەمانیش بە ئاسانی لەیەكتری جیادەبنەوە. چونكـــە منالیـــش ڕۆژیك دیت ژیانـــی تایبەتی خـــۆی دەبیت و لە بـــاوك و دایكـــی دوور دەكەویتەوە، دەی ئیســـتا هەوڵ بدە ئەو دوو پەنجەیەی ئەلقەی هاوسەری تێ دەكرێ، ئایا بەبێ جیابونەوەی ئەو پەنجانەی كە دەوری خۆمان دەبینن و لە ناوەڕاستەوە نوشتابونەوە ئەتوانیـــن ئـــەوە بكەین و ئەو دوو پەنجەی ئەلقەی هاوســـەری تێ دەكـــرێ لە یەكتـــر جیابكەینەوە؟! بە دلنیایـــی نەخیر (بە كردەوە



تاقـی بکەرەوە)، هەرگیز ناتوانی یەك تۆزیش ئەو دوو پەنجەیە لە یەکتـر دوور بخەیتـەوە، ئەزانی بۆ؟! چونکە ژن و مێرد پێویستە هەمیشە بە یەکەوە بژین و بە یەکەوەبن و لە خۆشی و ناخۆشیدا، لە هەژاری و دەوڵەمەندیدا لەیەکتر دورنەکەونەوە، چونکە هەموو کات هاوبەشی ژیانی یەکترن... ئایا تۆش ئەم بیرۆکەیەت بەلاوە جوان نییـە کەچینیەکان لە کۆنـدا بیریان لێ کردۆتەوە؟! بە دڵنیاییەوە بەڵـێ بیرۆکەیەکـی جوانە... دەی کە ئەڵقەی دەسـتگیرانیت کردە دەسـت بڕیار بدە هیچ کات لە هاوسـەرت دورنەکەویتەوە، چونکە دوورکەوتنەوە لە هاوبەش و خۆشەویسـتی ژیانت یانی لە ناوچونی خۆت!!.. بەڵێ لە ئیسلامدا هاوسەرگیری بۆ ماوەیەکی کاتی بەتاڵە و قەدەغەکراوە تەنانەت زانایانی شەرع فەرموویانە: دروست نییە لە کاتی مارەکردندا باسـی کات بکرێ تەنانەت ئەگەر بشوترێ تا کاتی مردن! خۆ ڕاسـتە بە مـردن ژن و مێرد لەیەك جیادەبنەوە، بەڵام ژن و مێرد ئەگەر بەهەشـتی بن هەردوولایان ئەوا لە بەهەشتیشـا بەیەکـەوە دەبن، بۆیە خۆشەویسـتی ڕاسـتەقینە و پاك و بێگەرد لـە نێوان ڕەگەزی نێرومێدا ئەوەیە کە بە هاوسـەرگیری شـەرعی دروسـت ببێ، چونکە نەك هەر لە دنیادا، بەڵکو بە هەمیشـەیی لە ژیانی نەبڕاوەی بەهەشـتدا بە یەکەوە دەبن.. دەگێڕنەوە: ژنێك بە هاوسەرەکەی وت: خۆشترین سات بە لاتەوە چ ساتێکە؟! مێردەکەی سـەیرێکی کردو وتی: هێشتا نەهاتووە! ژنەکە کەمێك دڵتەنگ بوو،





وتی: ئەوە چ ساتێکە کە نەهاتووە؟ ئەویش وتی: خۆشەویستەکەم. ئەو ساتەیە کاتێك تۆی هەناسە و دڵم دەرگام بۆ ئەکەیتەوەو ئەڵێیت: یاخوا بەخێر بێی بۆ بەهەشت ئەی هاوسەرە باشەکەم!..
ئای چەند خۆشە ژن و مێرد بەم بیرکردنەوە پڕ لە ئارەزووی بە یەکەوەبوونی هەتاهەتاییە بە یەکەوە بژین.. نەك بۆ چەند مانگ و ساتێك بە قوربانی یەکتری بن، بەڵام کە بە حەڵاڵی بە یەك گەیشتن ئەمجا لە یەکتری بێزار بن.

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز: لە سەرەتای وتارەکەوە وتمان کە مرۆڤی موسڵمان هەموو ژیانی خۆشەویستییە خۆشەویستی خواو پێغەمبەرو ئیمان و ئیمانداران وخاك و نیشتیمان و چاکان و خزمەتگوزانی گەل و میللەت و دین و ژین، جا ئەگەر کوڕو کچێك ئەم خۆشەویستیانەیان هەبێ. وە بەتەواوی لە مانای ئەم خۆشەویستیانە گەیشتبن، ئەمجا کە گەیشتنە تەمەنی گونجاوی خۆیان و بە مەبەستی هاوسەرگیری و سوکنا بە یەکەوە، خۆشەویستیان لە نێواندا دروست بوو وە لە ناخی دڵەوە یەکتریان خۆش ویست، ئەوە دەبنە جێگای ئومێد بۆ خۆیان و خێزانەکانیان و گەل و وڵاتیان، بەڵام ئەگەر کوڕێك یان کچێك هەموو دین و ئیمان و هەموو خۆشەویستەکانی بکات بە قوربانی کچێك یان کوڕێك ئەوە بەدڵنیاییەوە سەرەنجام بێوەفاش دەبێت بەرامبەر بە خۆشەویستەکەی و ڕۆژێك یان وازی لێ دێنێ. یان خیانەتی لێ دەکات و بە قوربانی کەسێکی تر دەبێت.



بەڕێزان: وتمان خۆشەویستی نێوان هەردوو ڕەگەزی نێرومێ غەریزەیەکە کە خوای پەروەردگار بە حیکمەت و کاربەجێیی خۆی لە ناو مرۆڤ دای ناوە. وە پرسیارێك کە دەکرێ و پرسیارێکی شیاوو بەجێیە ئەوەیە: ئایا لایەنی مێینە (کچ) بۆی هەیە دەست نیشانی کەسی شیاو بۆ خۆی بکات و هەڵی بژێرێ بە هاوسەری خۆی؟ لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ بە مەرجێ ئەو کوڕەی هەڵسەنگاندبێ و دوای هەڵسەنگاندنی، ئەمجا جوانتر وایە لە ڕێگەی کەسێکی ترەوە پێشنیاری ژیانی هاوسەری لەگەڵ بکات، خۆ ئەگەر کەسی گونجاویش بۆ ئەو مەبەستە دەست نەکەوت. ئەوە دروستە کچ خۆی ئەو پێشنیارە بخاتە بەر چاوی ئەو کوڕەی کە بە ڕاستی شایانی ئەوەیە کچ خۆی پێشکەش بکات، هەروەکو دایکە حەوا خۆی داوای لە باوکە ئادەم کرد. چونکە لەو کاتەدا کەسی تر نەبوو کە ئەو پەیامەی بگەیەنێ، بەڵام وەکو پێشتر وتمان ئەگەر کەسێکی شیاوو ئەمین و دڵسۆز هەبوو کە پەیامی ئەم کچە ژیرە پاکە بگەیەنێتە ئەو کوڕە بەڕێزە دیندارە بەڕەوشتە بە مەبەستی دروستکردنی خێزانێکی بەختەوەر، ئەوە وا چاکە لە ڕێگەی ئەو کەسەوە ئەو خۆشەویستییەی ناو ناخی دڵی بگەیەنێ.

لەم بارەیەوە دوو نمونە باس دەکەین:

١)- قورئانی پیرۆز باسی ئەو کاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە حەزرەتی (موسا) (سەلامی خوای لێ بێ) بۆ ڕزگاربوون لە پیلانی ژەهراوی






فیرعەون کە تەمای کوشتنی کردبوو، میصری بەجێ هێشت و ڕووی کردە وڵاتی مەدیەن، کاتێ بە ماندوویی و برسیەتی گەیشتە ئەو شارە لە ژێر دارێکدا پشووی دا، سەرنجی ئەو خەڵکەی دا کە لەوێ بوون و خاوەنی مەڕو ماڵات بوون، هاتبوونە سەر ئەو تاکە سەرچاوەی ئاوەی کە مەڕو ماڵاتیان لێ ئاودەدا کە بیرێکی قوڵ بوو، ئاویان لێ دەردەهێناو ئەیانکردە دۆل و تەشتی گەورەوەو مەڕو ماڵاتەکەیان ئاو دەدا، ئەم بیرە ئاوە بە تاشەبەردێکی گەورە سەری داپوشرابوو، ئەو مەڕدارانە یەك یەك دەهاتن و بە هاوکاری یەکتری تاشە بەردەکەیان لادەبرد و مەڕوماڵاتەکەیان ئاودەدا. دواتر بەردەکەیان دەخستەوە سەر بیرەکە، بەڵام حەزرەتی موسا بینی وا دوو ئافرەت دوو کچی تازە پێگەیشتوو لەولاوە دەوری مەڕەکانیان گرتوەو زۆر بە ئەدەب و حورمەتەوە وەستاون کە پیاوەکان مەڕو مەڵاتەکەی خۆیان هەمووی ئاو دا، تاشە بەردە گەورەکەیان خستەوە سەر دەمی بیرەکەو ڕۆیشتن و غیرەت و مەردایەتی ئەوەیان نەبوو کە مەڕی ئەو دووکچەش ئاو بدەن، ئەو دوو کچەش ئەوەندە ژیرو تێگەیشتوو بوون کە ئەو خەڵکە بێهەست و بێویژدانەیان ناسی بوو نەدەهاتن تەکلیفیان لێ بکەن بۆ یارمەتیدانیان، چونکە دەیانزانی ئەو کاتە لەبەر چاکەو مەردایەتی یارمەتیان نادەن، بەڵکو لەبەر تەماحکردنە ئەوان و چاوتێبڕین و قسە لەگەڵکردن و تێرکردنی ئارەزویان هاوکاریان دەکەن!. بۆیە لێیان نزیك نەدەبوونەوە. کە

لێرەدا وانەیەکی گەورەیــان فێری کچانی ئیماندار کرد کە هەرکات پێویســتیەکیان هەبوو زانیان کوڕێك پیاوێــك لەبەر مەردایەتی و جوامێری و چاکەخــوازی هاوکاریان ناکات، بەڵکو بۆ حەزتێرکردن خــۆی هاوکاری دەکات نابــێ داوای یارمەتی لێ بــکات. بەڵێ دوای ڕۆیشــتنی خەڵکەکە -پیاوەکان- ئــەم دوو کچە بەڕێزە مەڕەکەیان بــردە نزیــك بیرە ئاوەکــە و هەوڵی لابردنی تاشــەبەردەکەیان دا، بــەڵام چونکــە تەنهــا دوو کەس بــوون و زۆر بەهێزیــش نەبوون زۆر بــە ناڕەحەتی بەردەکەیان بۆ دەجولا، بۆیە حەزرەتی موســای تــازەلاو کە لــە ژێر درەختەکەوە ئەمەی بینی هەڵســاو لێیان چوە پێشەوەو قســەی لەگەڵ کردن (لە ئیسلامدا قسەکردنی نێوان کوڕو کچ حەرام نییە، بەڵام مەرجە بۆ پێویستی بێ، وەکو ئەم حاڵەتەی کە پێویستی کرد موسا لەگەڵ ئەم دوو کچە قسەبکات). بەڵێ کوڕی موســڵمان نابێ بێ هەڵوێســت بێ ، حەزرەتی موسا نەیفەرموو: جا مــن حەقم چییە بە ســەریانەوە، بەڵکو چوە پێشــەوە بۆ لایان و ســەلامی لێ کردن و فەرمووی: ﴿مَا خَطْبُكُمَا﴾. ئیتر زیاتری لەسەر نەڕۆیشــت نەیفەرموو: ئای ئەو بەردە چەند قورســە ئەوە جارانی پێشوو چۆنتان لابردوە، ئەوە ئەو خەڵکە بۆچی ئاوا بێ ڕەحمن بۆ یارمەتیــان نەدان؟! نەخێر ئەم قســانەی نەکرد، با بچینە خزمەت قورئان و بەسەرهاتەکە وەکو خۆی بخوێنینەوە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ

ٱلنَّاسِ يَسۡقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمۡرَأَتَيۡنِ تَذُودَانِۖ قَالَ مَا خَطۡبُكُمَاۖ قَالَتَا لَا نَسۡقِي حَتَّىٰ يُصۡدِرَ ٱلرِّعَآءُۖ وَأَبُونَا شَيۡخٞ كَبِيرٞ (٢٣) فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ ﴾ القصص: ٢٣ -٢٤.

بەڵێ حەزرەتی موسا تەنها ئەوەندەی بەو دوو کچە وت: ﴿ مَا خَطۡبُكُمَاۖ ﴾ ئەوە ئێوە بۆچی لێرە وەستاون؟ کێشەتان چییە وا دوورەپەرێزن؟! بەم چەند وشەیە پەیامەکەی خۆی گەیاند، ئیتر نەکەوتە ناو قسە و باسی درێژەوە دوو کچەکەش بە ئەدەبەوە وەڵامیان دایەوەو وتیان: ئێمە ناتوانین ماڵاتەکەمان ئاو بدەین هەتا شوانەکان نەڕۆن و چۆڵی نەکەن.. ئالێرەدا دەرفەتی پرسیارێك بۆ موسای گەنجی لاو درووست دەبێ کە بڵێ: باشە هۆی چییە تووشی شوانی بوون؟! ئەی ئەوە باوکێك برایەك کەسێکتان نییە؟! دوو کچەکە نەیان هێشت موسا ئەو پرسیارەیان لێ بکات خۆیان بە دوو وشە بۆیان ڕوون کردەوەو وتیان: ﴿ وَأَبُونَا شَيۡخٞ كَبِيرٞ ﴾. باوکیشمان پیرەمێردێکی بە ساڵاچوە، بەڵێ تەنها ئەمەندەیان وت ئیتر نەکەوتنە قسەکردن لە بارەی ئەوەی باوکیان پیرەو نەخۆشە و تاقەتی نەماوە و ناتوانێ لە ماڵ بێتە دەر، بەڵکو بە ﴿ وَأَبُونَا شَيۡخٞ كَبِيرٞ ﴾ هەموو مەبەستەکانی گەیاند. ئیتر حەزرەتی موساش دانەنیشت دەست بکات بە قسەکردن لەگەڵیان، بەڵکو ﴿ فَسَقَىٰ لَهُمَا ﴾ موسا مەردانە ماڵاتەکەی بۆ ئاو دان، سەرنج بدەن دەفەرموێ: ﴿ فَسَقَىٰ ﴾ نافەرموێ: [ ثُمَّ سَقَىٰ]. یانی موسا هیچ خۆی نەخافڵاندو نەکەوتە

قسەکردن، بەڵکو کارەکەی بۆ جێبەجێ کردن. ﴿ثُمَّ تَوَلَّىٰ إِلَى الظِّلِّ﴾ ئەمجا کە مەڕو ماڵاتەکەی بۆ ئاودان پشتی تێ کردن و چووە ژێر سێبەرەکەو لە خوا پاڕایەوە فەرموی: پەروەردگارا بە ڕاستی تۆ خێرو بێری زۆرت بەسەردا ڕژاندووم، بەڵام هێشتا هەژارم و محتاجی بەخششی زیاترم... بەڵێ کاتێ کچەکان چونەوە بۆ ماڵەوە مەڕوماڵاتەکەیان ئاودا بوو، باوکیان سەری سوڕمابوو کە بۆچی وا زوو هاتنەوە بۆ ماڵەوە، لە کاتێکدا ڕۆژانی تر زۆر درەنگ دەگەڕانەوە بۆ ماڵ، ئەوانیش باسەکەیان بۆ گێڕایەوە، شوعەیب فەرمووی: بڕۆن ئەو کوڕە باشە کە دەڵێن ڕێبوارەو نەناسیاوە بانگ بکەن، چونکە دیارە خانەخوێیەکی نییە، بۆیە لە ژێر ئەو درەختە پشووی داوە، هەروەها پێم خۆشە سوپاسی بکەم لە سەر ئەو چاکەیەی کە لەگەڵ ئێوەی کردوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَجَاءَتْهُ إِحْدَاهُمَا تَمْشِي عَلَى اسْتِحْيَاءٍ قَالَتْ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا فَلَمَّا جَاءَهُ وَقَصَّ عَلَيْهِ الْقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفْ نَجَوْتَ مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ القصص ۲۵. واتە دوای تاوێك یەکێك لە کچەکان هات بۆ لای موسا زۆر بەشەرم و حەیا دەڕۆیشت بەڕێگەدا، کە گەیشتە لای پێی وت: باوکم بانگت دەکات و حەزدەکات پاداشتی ئەو چاکە و ئاودانی مەڕوماڵاتە، کە بۆ ئێمەت ئەنجام دا بداتەوە..

ئیمانداران: بە وردی سەرنجی ئایەتەکە بدەن: ئەم ئایەتە کە باسی شەرم و حەیا و حورمەتی کچەکە دەکات بەدوو شێوە مانای






لێک دەدرێتەوە یەکەم: ﴿ فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ ﴾ بەم جۆرە ماناکەی وایە کە ئەو کچە زۆر بە شەرم و شکۆ و حەیا و حورمەتەوە بە ڕێگەکەدا دەڕۆیشت حەیاو شەرمی لێ دەباری...

دووەم: دەتوانرێ ئاواشی بخوێندرێتەوە: ﴿ عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ قَالَتۡ ﴾ زۆر بەشەرم و ئەدەب وحەیاوە قسەی لەگەڵ موسا کردو وتی باوکم بانگت دەکات... لێردا گرنگی شەرم و شکۆ و حەیا بۆ ئافرەت باس دەکات کە ئاگاداری خۆی بێ قورسایی و سەنگینی خۆی لە دەست نەدات، قورسی و سەنگینی ئافرەتیش لە دوو شتا دەردەکەوێ.

یەکەم لە کاتی ڕۆیشتن بە ڕێگادا دەردەکەوێ ئافرەتێکی هەرزەو کاڵ فامە یان کەسێکی خاوەن کەسایەتی و قورسە، دوەمیان لە کاتی قسەکردندا ئافرەت لە قسەو گفتوگۆدا ئەگەر خاوەن شەرم بوو، مەبەست لە شەرمی ئافرەت ئەوە نییە دەمی تێکەڵ و پێکەڵ بێ و قسەی بۆ نەکرێ و تەریق بێتەوە بەرامبەر بە پیاو، بەڵکو مەبەست لەوەیە قسەی هەرزەو نابەجێ و سوك نەکات کە پیاوی دڵ و دەروون نەخۆش یەکسەر وا بزانێ ئەم ئافرەتە بۆی سوتاوەو ئیتر بکەوێتە دوای و هەوڵی ئابڕوبردنی بداتا.. تەماشای ئەم کچە زیرە خاوەن حەیاو حورمەتە بکەن کاتێ بە موسای وت: باوکم بانگت دەکات، مەجالی موسای نەدا بڵێ باوکت منی بۆچییە، هەر خێرا خۆی هۆکاری بانگکردنەکەی بۆ باس کردو بە ڕوون وئاشکرا ئامانجی بانگکردنەکەی پێ ڕاگەیاند، کە بۆ سوپاسلێکردن







و پاداشتدانەوەی ئەو کارە مەردانەیەتی کە لەگەڵی کردون! ئەمەش لە پێناوی ئەوەی ئەم گفتوگۆیەی لەگەڵ ئەم کوڕە نەناسراوە درێژە نەکێشی و لە پێویستی دەرنەچێو لەسەر کەسایەتی و حورمەتی نەکەوێ!.. بەڵێ کاتێ حەزرەتی موسا گەیشتە لای ماڵی حەزرەتی شوعەیب و نانی خواردو پشوی داو زۆر بەگەرمی لەلایەن شوعەیب پێغەمبەرەوە پێشوازی و سوپاسی لێ کرا ئیتر موساش باس و بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيۡهِ ٱلۡقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفۡۖ نَجَوۡتَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ القصص: ٢٥. واتە: کاتێك موسا گەیشتە لای باوکی کچەکان، دوای حەوانەوە هەموو بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە، باوکی کچەکان وتی: مەترسە تۆ ئیتر ڕزگارت بوو لەدەست قەومی ستەمکار....

بەڵێ کاتێ موسا پشوی داو نانی خواردو حەسایەوە. یەکێ لە کچەکان بە بێدەنگییەوە بانگی باوکی کردو پێی وت: ﴿ قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ﴾ القصص: ٢٦. واتە: یەکێك لە کچەکان وتی: بابە بۆ بەکرێی ناگریت چونکە بە ڕاستی چاکترین کەسێك کە تۆ بیگریت بەکرێ ئەم پیاوە بەهێزو ئەمین و دەستپاك و دەرون پاکەیە، باوکی فەرموی: کچی خۆم بەچی ئەزانی کە ئەم کوڕە ﴿ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ﴾. وتی: باوکە گیان بەوەدا ئەزانم کە بەهێزو بە توانایە، چونکە بەردەکەی بە ئاسانی لابرد وە کە هاتین بەرەو ماڵەوە ئەو لە پێشمەوە ئەڕۆیشت




و پێــی وتم: ئەگەر ڕێگام هەڵەکــرد بەردوچکەیەك بەرەو ئەولایە فــڕێ بدە کە دەبێ پێیدا بڕۆم، پێشــتریش کــە ماڵاتەکەی بۆ ئاو دایــن تەماشــای نەدەکردین، کــە کارەکەی تەواو کــرد خێرا لێمان دوورکەوتەوەو قســەی لەگەڵ نەکردین و زۆر بەشــەرم بوو، بەوەدا دەزانم کە کوڕێکی ئەمین و دەستپاك و دەرونپاکە و چاوپاکە.

بەڕێزان: مەبەســتی باســەکەمان لێرەدایە: ئەم کچە بەو هەموو حەیاو شــەرمەوە کە خوای پەروەردگار شاهیدی بۆ دەدات سەرنجی لاشە و لەش و ڕوخساری داو تەماشای ڕەوشت و ئەخلاقی بەرزی و توانای کارو کەسابەتی کردو دوای ئەوەی کە بەتەواوی دڵی چوە سەر موســاو بە کەسێکی شــیاوی زانی کە ببێتە هاوسەری ژیانی زۆر بە جوانی و بە شێوەیەکی پڕ حیکمەت بە باوکی گوت: ئەم کوڕەم بەدڵە، بەڵام ئەم قسەیەی کرد بە ناواخنی ئەوەی کە وتی: باوکە بیگرە بە شــوان بۆ مەڕوماڵاتەکەمان، ئێ خۆ ئاشکرایە شوانێك کە خۆی ماڵ و حاڵ و کەسوکارێکی لەو جێگایەدا نەبێ، دەبێ شەو و ڕۆژ لە ماڵی خاوەن ئاژەڵ بێ، دەی خۆ ناکرێ کوڕێکی ئاوا بە نامەحرەمی لەگەڵ کچی گەنجدا لە ماڵدا بێ، بۆیە باوکەکە یەکسەر لەم قسەیە گەیشت و لەکچەکەی و نیازی ناو دڵی تێگەیشــت، بەڵێ باوك دەبێ ئاوا لە هەست و ســۆزی کچەکەی تێ بگات، نابێ باوك هەر ئیشی حەماڵی بێت بۆ ماڵ ومناڵی و هەر کاســبیان بۆ بکات و عەلاگە خواردن و جلوبەرگیان بۆ بێنیتەوە، بەڵکو باوکی ڕاستەقینە ئەوەیە کە دەبێ








گوێ بۆ کچ و کوڕەکانی بگرێ ڕێز لە بۆچون و هەست و نەست و خۆشەویستیان بگرێ، نەك بە ناوی غیرەت و پیاوەتییەوە هەر ئەوەندە کچەکەی وتی فلان کوڕ کوڕێکی باشە و بەڕێزە کچەکەی بکوژێ و بڵێ دیارە حەزت لێیەتی نەخێر ئەمە موسڵمانیەتی و پیاوەتی نییە، بەڵکو موسڵمانیەتی و خواناسی و مەردایەتی ئەوەیە: کچەکەت وا پەروەردە بکەی کە هێندە سەنگین و خاوەن کەسایەتی بەهێزو حەیاو حورمەت بێ هیچ لات و لەوێرێ نەتوانێ پڕ بە چاو سەیری بکات وە ئەوەندەش ئازادو ئازا پەروەردەت کردبێ کە تواناى هەڵسەنگاندنی کەسی شیاوو چاکی هەبێ و بۆ خۆی بڕیاری هەڵبژاردنی هاوسەرو هاوژینی خۆی بدات و بە حەیاو حورمەتەوە ئاماژەی پێ بکا، بەڵێ کاتێ حەزرەتی شوعەیب لە دڵی کچەکەی گەیشت بێ دوو دڵی و سڵەمینەوە بە موسای گوت: ﴿ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖۖ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ القصص: ٢٧. واتە: باوکیان پێشنیاری کچەکەی پێ باش بوو ووتی: من پێم چاکە بتکەم بە کوڕی خۆم بەزاوای خۆم یەکێك لەم دوو کچەت لێ مارەبکەم بەمەرجێ ئەوەی هەشت ساڵا لای من کاربکەیت خۆ ئەگەر دەساڵیشت بردە سەر ئەوە چاکەی خۆتە منیش نامەوێت بێزارت بکەم و زۆرت بۆ بهێنم دەمبینیت ئەگەر خوابیەوێت لە چاکان دەبم... حەزرەتی موساش یەکسەر






قبوڵی کردو فەرموی: ﴿ قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ ۖ أَيَّمَا الْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَانَ عَلَيَّ ۖ وَاللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴾. القصص: ٢٨. واتە: موسا فەرمووی: ئەم پەیمانە لە نێوان من و تۆدایە من پێی ڕازیم، بەڵام هەرکام لەو ماوانەم بۆ تەواو کرا، با ستەمم لێ نەکرێت و ئازاد بم. خوای گەورەش شایەت و ئاگایە بە وەی کە دەیڵێین و بڕیاری لەسەر دەدەین، ئێستا با چەند سەرنجێك لە سەر ئەم بەسەرهاتە قورئانییە وەربگرین:

١) شوعەیب پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ: بۆ خۆی داوای لە موسا کرد یەکێ لە دوو کچەکەی بداتێ. بەڵام دیاری نەکرد کامیان. فەرموی: ﴿ إِحْدَى ابْنَتَيَّ ﴾. بۆچی دیاری نەکرد؟ بۆ ئەوەی موسا بۆ خۆی دڵی کامیانی گرتوە ئەومیان هەڵبژێرێ. نەوەك خۆشەویستی ئەم کچەکەی کە پێشنیارەکەی کرد، هەر لە لای کچەکەیەوە بێ و تاکلایەنە بێ و موسا حەزی پێ نەکات!! سەیری ئەم وردبینییە. وە پاشان حەزرەتی شوعەیب ئەوەش دیاری دەکات و ئەو وانە گەورە فێری باوکان دەکات کە: هیچ عەیب و نەنگیەکی تێدا نییە کە باوك چۆن خوازبینی بۆ کوڕ دەکات و دەچێتە داوای کچی خەڵك، ئاواش خوازبێنی کوڕێك بۆ کچە باش و حەیاو بەشەرمەکەی بکات و پێشنیاری ئەوەی بخاتە بەرچاو کە حەز دەکات بیکات بە کوڕی ماڵی و زاوای. بەڵام لێرەدا وا چاکە ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە: (لێرەدا موسا کەسو کارو خزم و ئاسیاوێکی لە مەدیەن نییە. خۆ




ئەگـەر کەسـی هەبوو چاکتـر وایە بە باوکی کوڕەکـە یان خزم و ناسیاوێکی بڵێ من دەمەوێ کچەکەم بدەم بە کوڕە باشەکەتان، یاخو لە ڕێی کەسـی سـێیەمەوە بە گوێیاندا بدات و ئەو کەسە بە ماڵی کوڕەکـە بڵێ بۆ ناچنە خوازبێنی کچی فلان کەس، بە ڕاسـتی ئەم کوڕ و کچە شیاوی یەکترن). بەڵێ کاتێ حەزرەتی شوعەیب کچەکەی پێشـکەش بە موسا کرد. یەکسەر ئەوەشی پێ وت کە خەمی ئەوەت نەبێ کە تۆ موڵك وسامان و کارو کەسابەتت لێرە نییە. وەرە لە ماڵی مندا کار بکە!.. ئەمجا حەزرەتی موساش ئەو کچەیانی هەڵبژارد کە هاتبوو بە شوێنیدا، هەرچەندە هەردوو کچەکە ڕێکوپێك بوون، بەڵام ئەمەیانی هەڵبژارد، چونکە ئەمەیانی هەڵسـەنگاند بوو، ئەویش بە وەی لە کاتی بانگکردنەکەیدا و قسـەکردنی لەگەڵ موسادا شەرم و حەیاو زیرەکی و وردبینی لە کچەکەدا بەدی کرد، ئەویش بەوەی کە ﴿ تَمْشِي عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ ﴾. بە شـەرم و ئەدەبەوە دەڕۆیشـت بەرێگادا یـان وەکو وتمان دەشـتوانرێ وا بخوێنریتەوە کە: ﴿ عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ قَالَتْ ﴾. بە شـەرم و شـکۆوە قسـەی کرد. وە هەروەها کاتێ وتی: ﴿ إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ ﴾. باوکـم بانگت دەکات. نەیگوت وەرە بۆ ماڵی ئێمـە، ئەمەش بە مانای باوکم هەموو شـتێکی ئێمەو ئەو گەورەی ماڵـە. {لێـرەدا ئەو وانە گەورەیـەی فێری کچان کـرد کە ئەگەر: کچێـك بە کوڕێك موعجـەب بوو یان کوڕێك کچێکـی بە دڵ بوو، داوای خۆشەویستی لێ کرد، با کچەکە پێی بڵێ: وەرە بۆ لای باوکم



خۆ ماڵمان دەزانی، وەرە بە شــەرعی خوا لە دەرگامان بدە، من خاوەن باوکم و ماڵ و حاڵم!}. ئەمجا سـەرنج بدەن کچەکە نەیگوت: وەرە بۆ ماڵمــان بمێنەرەوەو مــەڕۆرەوە. نەخێر بەڵکو فەرمووی: بۆ ئەوە وەرە بۆ لای باوکم ﴿لِيَجۡزِيَكَ أَجۡرَ مَا سَقَيۡتَ لَنَاۚ﴾. بۆ پاداشتی کاری ئاودانی مــەڕو ماڵاتەکەمان. بەڵام لــە ماڵەوە دڵی ئەکەوێتە پەلە پەل کە نەکا ئەم کوڕە باشــەی لە دەست بچێ، خێرا بە باوکی دەڵێ باوکە بیگرە بە کرێ. چونکە کە موســا هاتە ماڵیان زانی کە کوڕێکی غەریب و هەژارە و بێکەس وشەرمنە، لەوانەیە بە گونجاوی نەزانێ و هەرنەوێرێ باسی خوازبێنی بکات، بۆیە بۆ ئەوەی موســای لە دەست دەرنەچێ، خێرا بە باوکی گوت: باوکە گیان بە کرێی بگرە بۆ شوانی مەڕوماڵاتەکەمان و بۆ کاروباری ماڵمان و با لامان بمێنێتەوە، بەم شـێوەیە موساش بە وردی ئەم کچەی هەڵسەنگاند. {لێرەدا وەڵامێك بۆ ئەو کوڕو کچانە هەیە کە دەڵێن ئێمە پێویســتە لە زانکۆو پەیمانگا یان لە فەرمانگەیەکدا چەند ســاڵ و مانگ هاوڕێ بین و بە یەکەوە قسەبکەین و بگەڕێین و سەفەر بکەین، بۆ ئەوەی لە یەکتر بە باشی تێ بگەین و بزانین دەتوانین ببین بە هاســەری یەکتری}. نەخێر ئەو هەمــوو ماوەیەی ناوێ، ئەگەر کوڕ و کچ مەبەســتیان پاك بێ و بۆ هاوســەرگیری بێو دەستکەرمکردنەوە بە یەك نەبێ. وەکو موســا و کچەکەی شــوعەیب لە یەك دانیشــتن و چەند دێر قســە و یــەك تاقیکردنەوەدا بەتــەواوی بەرامبەرەکەی بۆ دەر دەکەوێ، بەڵێ بوون بە هاوســەری یەکتری و خۆشــترین ژیانیان





بە سەربرد ماوەی (١٠)ساڵ موسا لە ماڵی خەزوری مایەوە، ئەم کوڕ و کچە پاك و بەشەرمە، چونکە بە پاکی و بە هەڵسەنگاندن یەکیان هەڵبژارد لە ژیانی هاوسەریاندا زۆر بەختەوەربوون، نمونەیەك لە ژیانی بەختەوەریان لەم چەند خاڵەدا دەردەکەوێ:

١) موسا ماوەی (١٠) ساڵ لە ماڵی خەزوری مایەوە، وە هەستی بە بێزاری نەدەکرد. ئەوەندە لەگەڵ ماڵی خەزووری ڕێك بوو، ئەو هەموو دووری لە دایکی و براو خوشکی و قەوم و کەسی و نشتیمانی کە هەموو ساتێك لە یادی بوون و لێیان بێ هەواڵ بوو، بەڵام ماڵی خەزوری ئەوەندە بۆی باش بوون هەستی بە غەریبی نەدەکرد لە ناویاندا.

٢) کاتێ موسا وتی دەچمەوە بۆ میصر ژنەکەی نەیگوت چۆن لەگەڵت دێم بۆ غەریبی و دووری لە باوك و دایك و کەسوکارم، خوا ئەزانێ ئەیان بینمەوە یان نا، پاشان ئەی موسا تۆ بۆیە هاتوی بۆ ئێرەو وڵاتی خۆت بەجێ هێشتوە، چونکە کەسێکت لە دەست کوژراوە و ئێستاش بچیتەوە ئەت کوژنەوەو من سەرگەردان ئەبم، نەخێر ئەم ژنە هیچ کام لەم قسانەی نەکردو شوێن هاوسەرە دڵسۆزەکەی کەوت و خۆشی و ناخۆشی لەگەڵیدا قبووڵ بوو، بەڵام ئەمرۆ زۆر کچ و کوڕ دەبینی کە بە حساب بە خۆشەویستی بوونە هاوسەری یەکتری، کەچی کچەکە دەڵێ دەبێ کوڕەکە بێ بۆ لای ماڵی باوکم و دایك و باوك و شاری خۆی بەجێ بێڵی و ئەو بێت بۆ لای من، بەڵام موسا و هاوسەرەکەی ئەمەیان لەبەرچاو نەبوو.





٢) پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) فەرموویەتی: موسا و ژنەکەی ماوەی (١٠) ساڵ، تەنها یەك پێستی بەرانیان هەبووە کە لە سەری بخەون!! کەچی ڕۆژێ لە ڕۆژان ئاژاوەیەکی خێزانی وایان نەبووە کە شایانی باسکردن بێت.

بەڕێزان: قورئان کە ئەم باسانە و بەسەرهاتانەمان بۆ دەگێڕێتەوە، حیکایەت و چیرۆك نییە تەنها بۆ باسکردن بێ بەڵکو، ئەمە بەرنامەی ژیانمان بۆ دیاری دەکات و دەفەرموێ: ئەی کوڕ و کچی گەنج ئاوا بە هەڵسەنگاندن هاوسەری ژیانت هەڵبژێرە، نەك بە وەی زنجیری لە ملایە یان ئوتومبێلێکی مۆدیل بەرزی پێیە، یان هاندی موبایلەکەی فلان جۆرە!! یان کوڕ موعجیبی کچێك بێ کە هەموو لەشی کامل بۆیاغە و کە بینیویەتی مەلیکە جەمال بووە، کەچی کە دەبێتە هاوسەری و ماوەیەکی پێ دەچێ و سورو سپیاوو میکیاژکاری نامێنێ، دێوو درنجێك دەبینێ! ئەمجا بەرچاوی دەکەوێ و بە شوێن کچێکی تردا دەگەڕێ!..هەر بۆیە ئیسلام حەرامی کردوە کچ بە سەری ڕووتی و میکیاژکراوی و قۆڵ و قاچی ڕوتەوە لە ماڵ بجێتە دەرەوە، بۆ ئەوەی کوڕێك بەم دیکۆرە تەزویرەی نەخەڵەتێ و سەرەنجام خۆی سەرگەردان نەبێ و کوڕێك دەستی نەبڕێ و پاشان کە وەکو واقیعی جەستەی خۆی بینی بەرچاوی بکەوێت.. ئەمە بەسەرهاتی موسا پێغەمبەر و هاوسەرگیریەکەی لەگەڵ کچی شوعەیب پێغەمبەر سەلامی خوایان لە سەر بێ کە بە

خۆشەویستی و بە پاکی بە یەك گەیشتن و ژیانێکی بەختەوەرو ئاسودەیان بە یەکەوە گوزەراند.

نمونەی دووەم: هاوسەرگیری خەدیجە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ):

کاتێ خاتوو خەدیجە دڵی چوە سەر حەزرەتی محمد (ﷺ) و لە دڵی خۆیدا بڕیاری هاوسەرگیری لەگەڵ دا، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو خەڵکی مەککە و دەوروبەری پێیان دەوت (محمد أمین) ئەوەندە ئەمین و ئەمانەتپارێزو ڕاستگۆو دەستپاك و ڕەوشتبەرز بوو، کەچی خاتوو خەدیجە ویستی خۆی (محمد) هەڵسەنگێنێ و تاقی بکاتەوە، ئەوە بوو کە قافڵەی بازرگانیەکەی خۆی پێ سپاردو لەگەڵی ڕێك کەوت، لە بەرامبەر بڕێك پارەدا سەرقافڵەیی کاروانە بازرگانیەکەی بۆ بکات، مەبەستیش لەم کارەی تەنها تاقیکردنەوەی بوو دوای تەواوبونی بازرگانیەکەو گەڕانەوەیان، خاتوو خەدیجە لەو کەسەی پرسی کە کردبووی بە هاوڕێ و چاودێر بە سەر پێغەمبەرەوە (ﷺ)، وتی: محمەدت چۆن هاتە بەرچاو، ئەویش باسی هەموو ڕەفتارە جوان و بەرزەکانی پێغەمبەری خوای کرد وە ئافرەتێکی ڕاسپارد کە بە (محمد) بڵێ بۆچی ژن ناهێنێ، وە ئەم ئافرەتە پێی بڵێ ئەگەر حەز دەکەی ژن بێنی من هەوڵ دەدەم بەڵکو خەدیجە شووت پێ بکات، پێغەمبەری خواش (ﷺ) خاتوو خەدیجەی زۆر باش هەڵسەنگاندبوو، بۆیە زەواجیان کردو لەگەڵ ئەوەشدا کە خاتوو خەدیجە:



١)- لە تەمەندا (١٥) ساڵ لە پێغەمبەر (ﷺ) گەورەتر بوو.

٢)- خەدیجە بێوەژن بوو، پێشتر دوو جار ژیانی هاوسەری پێك هێنابوو، پێغەمبەری خوا کوڕ بوو!!

٣)- خەدیجە سەرمایەدار بوو، محمد (ﷺ) هەژار بوو....

بە هەموو پێوەرێك ئەم زەواجە سەرناگرێ، کەچی سەرکەوتووترین زەواج بوو، ئەوەتا:

١)- خەدیجە نەك هەر منەتی دەوڵەمەندی و خاوەن سامانی خۆی بەسەر پێغەمبەردا نەدەکرد، بەڵکو هەموو ماڵەکەی خۆی بە ئەوپەڕی خۆشەویستییەوە بەخشی بە هاوسەرەکەی و ئیسلام.

٢)- کە بوو بە پێغەمبەر، یەکەم کەس کە ئیمانی پێ هێنا، خاتوو خەدیجەی هاوسەری بوو، ورەی بەرزکردەوەو ڕۆژێ پێی وت: سوێند بە خوا خوای گەورە هەرگیز تۆ تووشی بەڵاو نەهامەتی ناکات، ئەگەر هەر ژنێکی تر بوایە دەیگوت ئای تازە تێداچوین، دانەنیشتی هەر چوویتە ئەو ئەشکەوتە، هەتا تووشی ئەو بەڵایە بویت! بەڵام خاتوو خەدیجە نەك هەر لۆمەو سەرزەنیشتی نەکرد، بەڵکو ئەوپەڕی پشتیوانی بۆ دەربڕی و موژدەی خێرو خۆشی پێ دەدا.

٣)- هەتا خاتوو خەدیجە وەفاتی نەکرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژنی تری نەهێنا، هەر بیریشی لێ نەکردەوە، ڕۆژێ لە ڕۆژانی ژیانی هەر باسیشی نەکرد. ئەوەندەی خاتوو خەدیجە خۆش دەویست دوای (١٤) ساڵ لە وەفاتی، ڕۆژێکیان لە دەرگای ماڵی پێغەمبەر



(ﷺ) درا. پێغەمبەری خوا لەژوورەوە دانیشتبوو، کە گوێی لە دەنگی دەرگاکە بوو. لە جێگای خۆی ڕاپەڕی و فەرمویـ ئەو لە دەرگادانە دەڵێــی دەنگی پەنجەکانی خەدیجەیــە!! کە دەرگایان کردەوە (هالە) ی خوشــکی خەدیجە بوو. سەرنج بدەن: ئەوەندەی خەدیجە خۆش ویستوە، شێوازی دەنگی لە دەرگادانەکەی لە مێشکیا وا تۆ مارکراوە دوای (١٤) ساڵ لە مردنی هەر لە بیریەتی!! ئایا ئەم خۆشەویستییە لــە ســەرو خەیاڵەوە نییــە؟! ئایا قورئان و ئیســلام و پێغەمبەری چاوســاغی ئێمە دژی خۆشەویســتییە؟ نەخێر بەڵام خۆشەویستی حەقیقــی، نــەك دڵــداری و پێڕابــواردن.. نەك لە ڕێگای مســیجی موبایلەوە یەکترناســین و چەند ســاڵ بە موبایل قســە بە یەکەوە کــردن، بە دزی دایك و باوك و ماڵەوە!! وەعدو بەڵێن بە یەك دان، پاشان لە یەکتر وەڕسبوون و لێکدابڕان.....!!.

بەڵــێ ئیماندارانی بەڕێــز: لە ئەنجامی ئەو شــیکردنەوەی کە کردمان بۆ بابەتی خۆشەویســتی نێوان کوڕ و کچەکان، گەیشــتینە ئەو ئەنجامەی کە: لە ئیســلامدا کــوڕ و کچ بۆیان هەیە یەکتریان خۆش بوێ، بەڵام بەم مەرجانە:

١)- هەردوولایان بە باشی یەکتری ببینن.

٢)- یەکتری بە چاکی بناســن، ناســین بە مانای هەڵســەنگاندن، ئەویش بە وردبوونەوە لە ڕەفتارو کرداری و تەماشــاکردن، ئەوەی ئایا ئەخلاقی بەرزە یان نا، ئایا پەیوەندی لەگەڵ ئیسلام و دینداری





و خواناسی چۆنە؟ ئەم دوو شتەیان بە لاوە لە هەموو بوارەکانی تر گرنگتر بێ.

٣)- دوای هەڵسەنگاندن ئەمجا بە یەکەوە دابنیشن، بەڵام بە ئامادەبوونی مەحرەمێك لەگەڵیان کە مەرج نییە لە ناو قسەکانیاندا ئامادە بێ، بەڵکو دەتوانێ لە دوورەوە چاودێریان بکات، ئەمەش تەنها بۆ پاراستنی حورمەت و کەسایەتی ئەو کوڕ و کچە کە ئەگەر بۆ یەك نەگونجان و تێگەیشتن لە نێوانیاندا درووست نەبوو، ئەوکاتە کەس نەتوانێ قسەیان بۆ هەڵببەستێ و بڵێ خوا ئەزانێ ئەم دوانە کە بە یەکەوە چوونە دەرەوە چیان وتوە. خۆ ئەگەر بکرێ ئەم دانیشتنە بە ئاگاداری دایك و باوکی هەردوولایان لە ماڵی باوکی کچەکە بکرێ زۆر باشترە بۆ ئەوەی ئەگەر نەگەیشتنە بڕیاری کۆتایی بۆ زەواج، بە نهێنی بمێنیتەوەو کەس پێی نەزانی و نەتوانێ تۆمەتیان بداتە پاڵ... بەڵێ پێویستە ئەو کوڕوکچە بە یەکەوە دابنیشن و قسەو گفتوگۆی تەواو لە بارەی ژیانی داهاتوی هاوسەریانەوە بکەن، بەڵام بە مەرجێ بە ئەوپەڕی ڕاستگۆیی و ڕاشکاوییەوە قسە بکەن و دووربن لە وەی کە سۆزو خۆشەویستی زاڵ بێ بە سەریانداو کوڕ هەر بۆ ئەوەی کچەکەی لە دەست نەچێ. ئەگەر چی بە هەزار حاڵ بتوانێ دوو ژوور بە کرێ بگرێ. کەچی بڵێ کام خانومت بە دڵە ئەوەت بۆ دەکڕم!! کچیش بە هەمان شێوە بە ڕاستگۆییەوە وەڵامی کوڕەکە بداتەوەو تەنانەت لە دوا بینینیدا





زۆر خـۆی بپارێزێ لەمیکیاژ و دەموچـاوی تەزویرکراو بۆ ئەوەی ڕوو ڕوخسـاری حەقیقی خـۆی ببینێ. وە مــەرج و داواکاریەکانی لەمسەرەوە بخاتە ڕوو.

٤)- ئەگــەر گەیشــتنە قەناعەتی تەواو کە بۆ یــەك گونجاون و ئەگــەر خوا پشــت و پەنایان بــێ دەتوانن ژیانێکــی بەختەوەر بە یەکەوە بەســەر بەرن، ئەو کاتە کاتی خوازبێنی دیاری بکرێ و بە ڕێــزەوە کچەکــە داوا بکــرێ و مارە بکرێ پێغەمبــەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: [لَمْ يُرَ لِلْمُتَحابَّيْنِ مِثْلَ التَزوجِ]. أخْرَجَهُ الحاكِم.

جا سەرنـج بدەن لە وشەی [لِلْمُتَحابَّيْن] یدا دان نانە بە خۆشەویستی نێــوان کوڕ و کچدا. بەڵام بەو مەرجەی بە ڕاســتی خۆشەویســتی بێ، خۆشەویســتی ڕاســتەقینەش ئەوەیە کە بە [زەواج] کۆتایی پێ بێو دووربێ لە کاتبەسەربردن و دەستپێگەرمکردنەوە. لە کۆتاییدا پرســیارێك دەکــرێو دەگوترێ: ئەگەر کوڕ و کچێــك یەکتریان بە دڵ بوو، بەڵام جارێ بە هۆی خوێندن یان بە هۆی دەســتکورتی و هــەژاری یان بێخانویی یان هەر هۆیەکی ترەوە، نەیان توانی بچنە ژیانی هاوســەریەوە، وە لەوەش دەترســان کە ناچار بکرێن بە وەی کە کچەکە شــوو بە کوڕێکی تر بکات، یان کوڕەکە کچێکی تر بێنێ و بۆ یەکتر نەبن.. ئا لەم کاتەدا دوای هەڵسەنگاندنی تەواو دروستە کوڕەکــە بە کچەکــە بڵێ یان بــە پێچەوانەوە کچەکــە بە کوڕەکە بڵــێ: من تۆم بە دڵە لــە ڕوی ئەخلاق و دین و جوانی و ئەدەب و



ڕەوشتبەرزیەوە، بەڵام کە ناتوانین ئەمڕۆ لەبەر فلان هۆکار بچینە خانەی هاوسەریەوە، وەرە با بڕیار بدەین ئەگەر ویستی خوای لەسەر بێ بۆ یەکتری بین، هیچمان ژیانی هاوسەری لەگەڵ کەسی تر قبوڵ نەکەین، بەڵام هەتا ئەو بەربەستەی بەردەممان لادەچێ بۆ نمونە: خوێندنەکەمان تەواوی دەکەین یان دەتوانم خانویەکی بچکۆلە درووست بکەم یان شتێ پارە پێکەوە بنێم بۆ ئەوەی کە هاتمە خوازبێنیت شتێکم بە دەستەوەبێ کە شەرمەزاری بەردەم ماڵی باوکت نەبم.. بەڵێ هەتا ئەوکاتە نابێ ئێمە هیچ پەیوەندیەکی تەلەفۆنی دەنگی یان نامەناردنمان لە نێواندا هەبێ وە بە هیچ جۆرێك نابێ بەیەکەوە بچینەوە دەرەوە. یان وێنەمان لای یەکتر بێت، مەگەر لە ڕێگای کەسێکی ئەمین وجێگای متمانەوە هەواڵی ساغ و سەلامەتی یەکتری بزانین، هەروەکو ئەو بەسەرهاتەی مامۆستای بانگخواز (عمرو خالید) کە لە نامیلکەی (خۆشەویستی)دا باسی دەکات و دەڵێ: (من هاوڕێیەکەم هەیە کچێکی زۆر بە دڵ بوو، زۆری خۆش دەویست، ئەم کوڕە زۆر ڕەوشتبەرزو دینداربوو بە کچەکەی گوت: من تۆم زۆر خۆش دەوێت و ناتوانم دەستبەردارت بم، بەڵام من تاوەکو خوێندنی زانکۆ تەواو نەکەم ناتوانم بتخوازم، بۆیە لەبەر خۆشەویستیم بۆ تۆ، خوا یار بێ دوای تەواوکردنی خوێندنەکەم دێمە خوازبێنیت و ژیانی هاوسەری پێك دێنین، چونکە هەست دەکەم بۆ یەك گونجاوین، بەڵام بۆ ئەوەی خۆشەویستیەکی پاك و



بێگەردو ڕاستەقینە بێ، بڕیارم داوە بە تەواوی پەیوەندیت لەگەڵدا بپچڕێنم، ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێ لە ماڵی خۆماندا یەکتری دەبینینەوە... بەڵێ هەردوو لایان ڕازی بوون و ئەو چەند ساڵەی زانکۆ تەلەفۆنێك یا نامەیەکی مۆبایل.. چونە دەرەوە.. گەڕانێك لە نێوانیاندا ڕووی نەدا.. خوای گەورە یارمەتی داو کوڕەکە زانکۆی تەواو کردو بە حورمەت و ڕێزەوە کەسوکاری خۆی ناردە لای باوکی کچە و ئەوانیش قبوڵیان کرد بە کوڕی خۆیان و مارەی کردو ئێستا خاوەنی (٥) منالەو ئەپەڕی ژیانیان خۆشە... مامۆستا عمروخالید دەفەرموێ: ئەو کوڕەی هاوڕێم وتی: ئێستاش خۆشەویستی ئەو کاتە کە لە دلمان هەڵمان گرتبوو، کە وەکو ئاگر لە ناخماندا بۆ یەك دەسوتاین، بەڵام نەمان هێشت ئەو خۆشەویستییە پاکە بە وشەیەکی ناشەرعی نێوانمان لیخن بێ، ئەو خۆشەویستییەی ئەوکاتە کە لە دڵماندا هەڵمان گرتبوو دوای (٥) منالٚ هەر تازەو گەرم و گوڕە!..)

لەملاشەوە: گەنجانێك هەن کە دەڵێن: من خۆشەویستیم لەگەڵ ئەو کچە زۆر پاکە.. پەنجەم بەر پەنجەی نەکەوتووە.. خیانەتەم لێ نەکردوە، بەڵام لەولاوە شەوو ڕۆژ وا بە موبایل قسەی لەگەڵ دەکات، یان نامەی بۆ دەنێرێ، یان لە فەیسبوکدا هاوڕێیەتی، ئەمەش خۆشەویستیەکی پاك و بێگەرد نییە، چونکە کاتێکیش کە بە حەلاڵی بە یەك دەگەن دوای ماوەیەکی کەم هەست دەکەن ئەو خۆشەویستیەی نێوانیان نەماوە، چونکە پێش ماوەیەکی کەم








هەســت دەکەن ئەو خۆشەویستیەیەی نێوانیان نەماوە چونکە پێش هاوســەرگیری ئەوەندەیان قســە بەیەکەوە کردوە، وەکو ژن ومێرد بووبن بە یەکەوە وا بوون، ئیتر ساردبوونەوە ڕوودەدات، هەر بۆیە دەبینی چەندین کوڕوکچ دوای چەند ســاڵ پەیوەندی خۆشەویستی لــە نێوانیاندا کاتێ کە بەیەك دەگــەن و زەواج دەکەن دوای چەند مانگێك یان ســاڵێك لە یەکتری دەکەونــە تەقەو تەڵاق و ئەو دوو خۆشەویســتەی کە بۆ یەکتری دەســوتان ئێستا لەداخی یەکتر خۆ دەسوتێنن!!.

**سەرچاوەکان:**


١- تەفسیری ئاسان. م. بورهان محمد أمین.

٢- المستفاد من قصص القرآن. د.عبدالکریم زیدان. ج ١، ص ٣٠٧.

٣- ژیانی پێغەمبەران. حاجی کاروان. ل ٢٠٧.

٤- نامیلکەی خۆشەویستی. عمروخالید. ل ٤٧.

٥- ڕۆژنامەی یەکگرتوو، ژ ٩٠٤ بابەتێکی م. کەمال ئەمین گوڵپی لە سەر خۆشەویستی.

٦- ڕوژنامەی یەکگرتوو، ژ ٩١١، ل ٩ . باسی ئەڵقەی هاوسەریەتی.




## وانەی سێیەم

# خۆشەویستی و ڕۆژی خۆشەویستی «ڤالانتاین»

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه أجمعين

ئیماندارانی بەڕێز کوڕ و کچە لاوەکانی میللەتە موسڵمانەکەم، ئێمە ئەمڕۆ کەوتوینەتە ڕۆژگارێکەوە، وە جیهان بە گشتی کەوتۆتە بارودۆخێکەوە کە لە زۆربەی شوێنەکانی سەرزەوی لە جیاتی ئاشتی و تەبایی شەڕو ناکۆکی و جەنگ و بۆنی خوێن و باروت هەیە، بارودۆخێکە ئەخلاق و ڕەوشتە جوانەکان، وشە ناسك و پاکەکان کە وەکو پەڕەی گوڵن دەشێوێندرێن و ناشیرین دەکرێن و بەرگێکی نامۆ بەخۆیان لەبەر دەکرێ کە لە بەرکردنی ئەو بەرگە نامۆیە پێی هەناسەی لێ دەبڕێ و لەناوی دەبات، ئەمڕۆ لە ڕۆژگارێکداین کە ناوی پیرۆزی پێغەمبەران و چاکان و پاکان بۆ ڕێنمایی کۆمەڵگا بەکار ناهێنرێ و لە شوێنیدا ناو (قەشەیەك) یان مولحیدێکی ئیباحی دەکرێتە ویردو باسی سەرزارو زمانان، بە تایبەتی چینی گەنج و لاوەکان.

ئەم شاعیرە بەحەق ڕاستی وتوە کە دەڵێ:





ئەم سەدەیە

سەدەی مەرگی ئینسانیەتە.

سەدەی خوێن و تەقینەوەو

هەڵواسین و دارو پەتە.

سینگی دنیا

وا لە چاکە داچۆڕاوە

هەموو کۆڵانی شارێکی

هەموو بن بەردو دارێکی

بە خوێنی ئینسان نەخشاوە.

ئێستا وەرە

ئازایەتی، وەفا، پیاوەتی

ناویان بێنە، باسی سەرە.

بێز لە بەفری کوێستان دەکری.

بێزوو لە ئاوی زێراب و میزکەرە!.

ناوهێنانی:

عیسا، موسا، یان محمد

نارەوایە.

ئەم سەدەیە نیازی پیسەو

خوا دەزانی

چی لە دڵی ڕەشیدایە.







شعری: نادری نادر پور، وەرگێڕانی بە دەستكاریەوە لە فارسییەوە: مستەفای سەعید مینە

بەڵێ بەڕێـــزان: ئەمڕۆ كەوتوینەتە زەمانێكەوە غەش لە هەموو شتێكدا دەكرێ، غەش و تەزویر لە خۆراك و قووتی ڕۆژانەی خەڵك، لـــە كڕین و فرۆشـــتن و معامەلـــەدا، لە سیاســـەت و بەڕێوەبردنی كاروباری وڵاتدا، یەكێكی تریش لەو بوارانەی كە غەشی تێدا دەكرێ باســـی (عەشق و خۆشەویســـتی)یە كە بە داخەوە ئەو وشە پیرۆزو پڕماناو ناســـكە. تەزویر دەكرێ... ڕۆژی (١٤/ ٢) ناو دەنرێ بە ڕۆژی عاشـــقان، ڕۆژی خۆشەویســـتی كە كراوە بە ڕۆژێكـــی جیهان، بەڵام ئـــەوەی كە زۆرتر لە هەمـــوو گەل و میللەتـــان بایەخی پێ دەدات گەلـــی كوردە! چەند ڕۆژو هەفتـــە پێش هاتنی، ڕیكلامی بۆ دەكرێ و هۆڵـــی بۆ ئامادە دەكـــرێ و گۆرانیبێژی بۆ بە كرێ دەگیرێ، ئەم ڕۆژی خۆشەویســـتییە كە (١٤/ ٢) ناویان ناوە ڕۆژی «ڤالانتاین» كە بەڕاستی ئەم وشەیە لەگەڵ ئێمەی موسڵماندا ناگونجێ چونكە:

١)- ئێمە شایەتمانمان هێناوەو وتومانە: [أَشْهَدُ أن لا إله إلاّ الله وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله] ئەگەر بە حەق ئەمانداری، دەبێ لەسەر ئەو شەریعەتە ژیان بەســـەر ببەی، ئێمەی موســـڵمان خاوەنی قورئان و «بوخاری و موســـلیم»ین، ئێمـــە شـــوێنكەوتەی «شـــافیعی و نـــەوەوی و إبن حەجەرین» ئێمە خاوەنی مێژووی خۆمانین، ئێمە مەلای مزگەوت پێشەوای ئاینیمانە ئیتر (ڤالانتاین)ی قەشە ئەگەر هەشبێ و خەیاڵ





نەبێ چی پەیوەندیەکی بە ئێمەوە هەیە؟!! ئەمە خۆسووککردنی موسڵمانە، بزانە تا ئێستا مەسیحی و جولەکەیەکت بینیوە یادی مەلایەکی موسڵمان بکاتەوە؟! دروشمێکی ئیسلامی زیندوو بکاتەوە؟ ئایا ئەوان بە هەموو شێوەیەك پابەندی بە دینی خۆیانەوە ناکەن؟! بەڵام موسڵمان کەیادی ڤالانتاین دەکاتەوە، نە لە موسڵمانیەتەکەی خۆی حاڵی دەبێت وحاڵی بووە، نە گاور وجولەکەش بە مەندە لای خۆیان قبوڵیانە، بەم شێوەیە لە هەردوولا دەبێ و بە تەعبیری قورئانی. ﴿خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ﴾.

٢)- ئەم دانانی ڕۆژی (٢/١٤) بە ڕۆژی خۆشەویستی، بۆیە لای ئێمەی موسڵمان بێ ئیعتبارە. چونکە گاڵتەکردنە بە خۆشەویستی، چونکە بچووککردنەوەی خۆشەویستییە، چۆن؟! سەرەتا دەبێ بزانین کە مرۆڤ هەر تەنها بریتی نیە لە خۆشەویستی، بەڵکو مرۆڤ (ژن بێ یان پیاو) پێك هاتووە لە لاشە، لە عەقڵ و ژیری و لە سۆزو بەزەیی لەگەڵ عاتیفە و سۆز، عاتیفە و سۆزیش چەند بەشی هەیە، تورەبوون هەر لە عاتیفەو سۆزەوە بۆ شتێك دروست دەبێ، ئەم غەم و پەژارە هەر عەتف و سۆزە، خۆشەویستی هەر بەشێکە لە عەتف وسۆز... کەواتە: ئەگەر کەسێك بڵێ مرۆڤ بەس تەنها خۆشەویستییە ئەی لاشەکەی؟ ئەی عەقڵ و ژیریەکەی؟! ئەی سۆزو بەزەییەکەی؟ ئەی ئەمانە چی لێ دەکەی؟ ئایا مرۆڤ هەرتەنها خۆشەویستییە؟ نەخێر.

ئەی بچووککردنەوەی خۆشەویستی نییە کە دەبێ خۆشەویستی هەر لەنێوان ڕەگەزی نێرومێ دا بێ، ئەی ئەوە بچووککردنەوەی خۆشەویستی نییە کە دەبێ خۆشەویستی هەر لە نێوان کوڕ و کچێکی نامەحرەمدا بێ؟! ئەی باشە (خۆشەویستی دایك، خوشك، ئەی خۆشەویستی نەوەو مناڵ، ئەی خۆشەویستی هاوسەری حەڵاڵی خۆت؟!) ئەمانە هەمووی لادەبرێن تەنها خۆشەویستی یەعنی ئەوەی کوڕێك وکچێك یەکتریان خۆش بوێ... پاشان بچوکترکردنەوەی خۆشەویستییەکەی نێوانیان، یەعنی هەوەسبازی.. دەسبازی.. فیکە فیك وموبایل و نامە ناردن و بەیەکەوە گەڕان و گوڵێکی سورو بەیەکەوە ڕابواردن، ئەمجا ئەگەر یەکتریان بە دڵ بوو دەبنە ژن و مێرد، ئەگەر بە دڵی نەبوو پەیوەندیەکە دەپچڕێنێ و لەگەڵ کەسێکی تردا دەیبەستێ، پاشان سوککردن و بچوککردنەوەی خۆشەویستی لەوەش زیاتر بۆ یەك ڕۆژی ساڵ کە چواردەی دووە!.. لەوەش سوکترکردن و بچوکترکردنەوەی خۆشەویستی ئەوەیە کە ئەم ڕۆژی (٢/١٤) لەسەر بنەمای کۆمەڵێ شت دروست کراوە کە پەیوەندی بە خۆشەویستییەوە نییەو زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی باسی دەکەن و گوڵی سوور پێشکەش دەکەن نازانن لەچییەوە هاتووە!.. بەڵام با بێنین ئەم (٢/١٤) و ئەم قەشە ڤالانتاینە بناسین... (٧٠٠) ساڵ پێش زایین دەوڵەتی ڕۆمی هەموو ساڵێ لە (٢/١٥)دا عادەت و باوێکی زۆر سەیرو غەریبیان هەبوو، ئەویش ئەوەبوو: یادی دامەزراندنی



دەوڵەتی ڕۆمیان دەکردەوە کە گوایە دەوڵاتی ڕۆمی لە سەر دەستی دوو منداڵ دروستکراوەو ئەو دەوڵەتە گەورە لەو دوو منداڵەوە دروست بووە کە کاتی خۆی باوکو دایکیان مردوون و پاشان گورگێك کە ناوی (لۆڤیا)یە واتە: دەڵە گورگ لەو ناوە بووەو منداڵەکانی لەگەڵ بەچکەکانی بەخێو کردوەو گەورەی کردوون و پاشان ئەو دوو منداڵە دەوڵەتی ڕۆمیان دامەزراندوە. جا هاتوون ڕۆژی (٢/١٥) یان هەڵبژارد، چونکە ڕۆژی پیتاندنی ڕووەکەکانە، ئەم ڕۆژەیان دیاری کرد بۆ یادی ئەو دوو منداڵە، دەهاتن دوو گەنجی کوڕیان دێناو ڕووتیان دەکردنەوە، پاشان لە مەیدانی شاردا سەگێكو بزنێکیان دێنا کە لە لای ڕۆمیەکان سەگ واتە: ڕەمزی خوای پاکیەتی و بێگەردی وە بزنیش واتە: خوای پیتو بەرەکەت، ئەمجا خۆینی سەگو بزنەکەیان دێناو بەسەر سەری ئەو دوو کوڕە گەنجەیاندا دەکردو پاشان ئاوا بە ڕووتی بە ناو بازاڕدا دەیان گێڕان وە لەملاولای شەقامەکەوە خەڵکی وەستابوونو بە سەرە دەهاتنو خۆیان لە لاشەی ئەم دوو گەنجە هەڵدەسوو وە داوایان دەکرد بەڵکو هەندێ لەو خوێنەی لاشەیان کە هی (سەگ و بزنەکە)بوو بەریان بکەوێ بە زۆری ئەو کەسانەش وایان دەکرد کە حەزیان دەکرد منداڵیان ببێ!! یان نەخۆش بوون بەڵکو چاك ببنەوە!! یان دەستکورت بوون بەڵکو ڕزقو ڕۆزیان بۆ فراوان ببێ!! بەڵێ مرۆڤ عەودالی پەروەردگاریەتی جا ئەگەر خوای حەقی نەدۆزیەوە لە ڕێگەی وەحیو پەیامی پێغەمبەرانەوە، ئەوە سەگو






بــزن دەکات بە خوای خــۆی، چاوەڕێی خێر و بەرەکەتو منالی لێ دەکاتو داوای شیفای نەخۆشی لێ دەکات!! بۆیە گەورەترین خەلاتی خوا بۆ ئێمەی موســلمانو گەورەترین قەدرو حورمەتی مرۆڤ ئەم ئیسلامەیە کە مرۆڤی ئاشنا کرد بە خوای تاکو تەنهاو هەموو ئەم ڕەزیلــیو عەقــل دۆگمابوونەی کە چاوەڕێی خێرو خۆشــیو ڕزقو شــیفاو بوونی منالە لە بتو بتخانەو خوێنی ســەگو بزنو مشكو پشیلەوە دورخستەوەو مرۆڤایەتی لێ ڕزگار کرد!. بەلێ موسلمانانی بەرێز: ئەم دابو دەســتورەی کە باســمان کرد لە دەولەتی ڕۆمیدا کە لە (٢/١٥)دا ئەنجامیان دەدا مایەوەو هەموو ســالێك ئەمە ئەنجام دەدرا، ئەمە لە سالی (٧٠٠)ی پێش زاینەوە مایەوە تاوەکو سالی (٢٧٠)ی زاینــی هەر بەردەوام بوو واتە: ماوەی (٩٧٠) ســال بەردەوام بوو، ئەمجا لە ســالی (٢٧٠)ی زاینیدا (٢/١٥) گۆڕا بۆ (٢/١٤) بۆچی؟! بۆچی ئــەم ڕۆژەی فــەرق کرد؟! لە ســالی (٢٧٠)ی زاینیدا پاشــای ڕوومی ئیمپراتۆر (کلۆدیۆس) کە بتپەرســت بوو وە دژی مەســیحیەت بوو تووشــی شــەڕ هات لەگەل دوژمنانی ڕۆم، بۆیە بڕیاری دا کە نابێت کــەس ژن بخوازێــتو ژن بهێنــی، چونکە لە کاتــی جەنگدا ئەگەر گەنــج ژنو منالــی هەبێ ئەوا دلی هەر لای ئــەوان دەبێت و خۆی بەخت ناکات و لە جەنگدا فیداکاریو گیانبەختکردویی ناکاتو هەر دلــی لای ژنو منالەکەی دەبێت، لێرەوە باســی (ڤالانتاین) دروســت دەبێت.. ڤالانتاین کێیە؟! ناوی کابرایەکی قەشەی مەسیحییە کە لە








کتێبەکاندا ناوی (١٣) قەشـــەی ڤالانتایــن هەیە، واتە: ڤالانتاین هەر لە ســەر ناوی یەك قەشــە ســاغ نەبۆتەوە، بەڵام (٣) ڤالانتاین ناوو بەسەرهاتیان ئاوا هاتووە:

بەســـەرهاتی یەکەم: ڤالانتاین قەشــە بانگەشەی دینی مەسیحی دەکــرد، ئیمپراتۆر (کلۆدیۆس)ی بتپەرســتی بانگــی کردو داوای لێ کرد کە وازبێنێ لە بانگەشــە بۆ مەسیحیەت، ئەویش وازی نەهێنا، ئیمپراتۆر قەشــە ڤالانتاینی خستە سجنەوە، لە زینداندا دەرگاوانی زیندانەکە سەیری کرد ئەم قەشەیە هەر خەریکی دوعاو پاڕانەوەیە، لــە بەرخوا چوە لایو وتی: مــن کچێکم هەیە (نابینا)یەو چاوی لە دەســت داوە، ئەگەر دوعای بۆ بکەی، بەڵکــو چاك بێتەوە، ئەویش وتی: کچەکە بێنن دەستی بە چاویدا هێناو خوای گەورە شیفای دا، پاشــان بە یەکەوە دەمانەوە، قەشە ڤالانتاین دەستی لەگەڵ کچەکە تێکەڵ کردو ئیمپراتۆر لە (٢/١٤)دا، سەری بڕی، ئەو کاتە سەرپەڕاندن لە جیاتی سێدارەی ئێستا بووە.

بەســـەرهاتی دووەم: ڤالانتاینی قەشــە بانگــی خەڵکی کردوە کە وەرن دەســـت لەوە هەڵگرن کە بە حەرامی کوڕ و کچ بەیەك بگەن، بەڵکو وەرن ببنە مەســیحیو پاشان من لە یەکتریتان مارە دەکەمو بە حەڵاڵی بە یەك بگەن، ئیمپراتۆری ڕۆمی لەسەر ئەمە لە (٢/١٤)دا سەری پەڕاند، دواتر کە دەسەڵاتی ئمپراتۆر کز بوو وە مەسیحەکان زۆر بوونو دەسەڵاتیان گرتە دەست، بۆ ڕێزلێنان لە قەشە ڤالانتاین

-کە لە پێناوی مەسیحیەتدا تێداچووە، (٢/١٤)یان کردە یادی ڤالانتاین ئەمەش جارێکی تر بەرەو کاڵبونەوە دەچوو، تاوەکو لە ساڵی (٤٩٦)ی زاینیدا لە هەندێ لە لادێکانی ئەوروپا عادەتو باوێکیان هەبوو ساڵانە لە (٢/١٥)دا، کە ڕۆژی پیتاندنی ڕووەکانە، دەهاتن هەرچی کوڕی ئەو گوندو دێیەیە ناونووسیان دەکردو وە هەرچی کچی ئەو گوندو دێیەشە، ئەوانیش هەموو ناونوس دەکران، ناوی کوڕەکانیان دەکردە تورەکەیەکەوەو ناوی کچەکانیش لە تورەکەیەکی تردا، ئەمجا کەسێك دەستی دەکرد بە هەردوو تورەکەکەداو ناوی کوڕێكو کچێکی دەردێناو ئەم دوانە دەبوون بە هاوڕێو عاشقو خۆشەویستی یەکتری تا ماوەی ساڵێك.{بە زاراوەی ئەمڕۆ ژمارەی کاتی یەکتربوون!!}. دوای ساڵەکە لە (٢/١٥)دا ناویان دەخرایەوە تورەکەکەوەو ئیتر بەر کەسێکی تر دەکەوتو بە لاشیانەوە شتێکی زۆر ئاسایی بوو... ئێستا لە ئەوروپاو خۆرئاوا بەگشتی (بۆی فرێندو گێرڵ فرێند) هەیەو هەر ئەوەی ئەو کاتەیەو زیندووکراوەتەوە، تا لە یەك بێتاقەت دەبن هاوڕێیەتیو پاشان کە ئارەزویان لەیەك نەما لە یەکتری جیادەبنەوە، ئێستاش لە ئەوروپاو ئەمریکا ژنو پیاوێك بڕیار دەدەن بە یەکەوە بژین، ئەمیان دۆشەکێ دێنێو ئەویان پشتیەك ئەو شەش قاپی قوڵ، ئەمیان شەش قاپی بەلەم، ئەم دوو کەوچك ئەم دووجنگاڵ، بەم شێوە سوکەماڵێك پێکەوە دەنێنو لە شوقەیەکدا بە یەکەوە دەژینو بە هەردووکیان کرێیەکەی





دەدەن، هەروەختێکیش حەزیان لە یەك نەما ئەم سەرینەکەی خۆی هەڵدەگریو ئەویشیان دۆشەکەکەی خۆی. ئەو قاپی شلەکەو ئەو قاپی برنجەکەو بەم شێوەیە لە یەکتر جیا دەبنەوەو ژنەکە دەچێت بۆ لای پیاوێکی ترو پیاوەکەش دەبێتە هاوڕێی ژنێکی تر!!
بۆیە ئێستا دوای قەیرانی ئابوری ئەمریکا گەورەترین موشکیلەو گرفتیان لێکهەڵوەشانی خێزانە! بەڵێ ئەوەی باسمان کرد لە دابو عادەتی سالآنەی ئەو گوندانەی ئەوروپا بەم شێوەیە مایەوە تاوەکو (قەشە جیلا سیوس) وتی: بە ڕاستی ئەمە دەستورو دابێکی ناشیرینەو کۆمەلگە هەڵدەوەشێنی، وەرن با بە دینی مەسیحی لە یەکیان مارە بکەینو سالآنە لە جیاتی (٢/١٥). با لە ڕۆژی (٢/١٤) دا. بە یادی ڤالانتاین لە یەکیان مارە بکەین... بە مانایەکی تر: لە مەسیحیەتدا ئەم یادی (٢/١٤)ی قەشە ڤالانتاین بۆ چارەسەری بەڕەڵاییو بەدڕەوشتی بوو! نەك بۆ دروستکردنەوەی پەیوەندی ناشەرعی، بەناوی خۆشەویستیەوە، لە ساڵی (١٩٦٩)ی زاینیدا کەنیسە مەسیحەکان، کە سەردەمی (پاپا پۆڵسی شەشەم) بوو ئەم ڕۆژی (٢/١٤)ی کردە پشووی ڕەسمی، کەنیسە وەکو ڕێزگرتن لە ڕوحی (ڤالانتاین)ی قەشە کە لە پێناوی مەسیحیەتدا سەربڕدراوە واتە: ڕۆژێکی ئاینی مەسیحی بوو، دواتر ئەم پشووەش هەڵوەشێنرایەوە.. لێرەوە (ڤالانتاین)ی قەشە کرا بە مەبەستێك بۆ چەند شتێكو ناونرا ڕۆژی عاشقانی جیهان، یان ڕۆژی خۆشەویستی وە جلی سورو



گوڵی سور کرا هێمای (بەناوی ئەو خوێنی سەگو بزنەی کە پێشتر باسـمان کرد). واتە: ئەم گوڵە سورە ڕەمزی پاکیو بێگەردیو پیتو بەرەکەتی نێوان ئەو دوو کەسەیەو مەبەستو ئاواتەکەیان دێتەدیو بۆ یەك دەبن ئەمەش کوفرو شیرکێکی صەریحە -نعوذ بالله-.

بەڕێزان: ئەگەر یەکێ بپرسێ: باشە بۆچی ڤالانتاین ئاوا بوو بە ڕۆژێکی جیهانیو بەم شێوەیە گەورە کرا؟! لە وەڵامدا دەڵێین بۆ چەند مەبەستێك:

یەکەم: مەبەسـتی بازرگانـی چەندین شـەریکاتو کۆمپانیا بە ملیارەهـا دۆلاریان دەسـت دەکەوێ، لەو ڕۆژدا لەڕێگەی فرۆشـتنی گوڵی سـورو کارتی خۆشەویسـتیو جلوبەرگی سـور کە تەنها بۆ چەند کاتژمێرێك بەکار دەهێنرێو دواتر فڕێ دەدرێو ئەو هەموو پارەیەش دەچێتە گیرفانی ئەو کۆمپانیاو شەریکانەوە! ئەوەتا لە لای خۆشمان لە کوردستان خۆ ماوەی چەند ساڵێکە ئەم ڤالانتاینو گوڵی سورە پەیدابووە وە ڕیکلام بۆ هۆڵی ئاهەنگەکانو گۆرانیبێژەکان بەو بۆنەیەوە دەکرێو دەعوەتی خێزانیو خۆشەویسـتان دەکرێو بە بێ ئەوەی هەسـت بە خۆیان بکەن بە سەدان دۆلاریان لێ دەکێشنەوەو وەکو بەنج بەنجیان دەکەنو وەختێ بە هۆش خۆیان دێنەوە بۆنەکە تەواو بوو تا سـاڵێکی تر تەواو!! جا ئەگەر بەم پێیە بێ پێش ئەم چەند سـاڵە کە ڤالانتاینو گوڵی سـور پەیدا بـوە لە ناومان کە وا بێ پێش ئەوە خۆشەویسـتی لە نـاو ئەم میللەتەدا نەبووە!! کە بە پێچەوانەوە پێش هاتنی ئەم باسە خۆشەویستی پاك هەبوو.





دووەم: بۆ مەبەستی مەشغولکردنو سەرقالکردنی گەنجان: گەنجێك كە هیچ مافێكی بۆ دابین نەكراوە، بۆ ئەوەی بیر لە دوا رۆژی خۆیو وڵاتو میللەتەكەی نەكاتەوە، بەم شتانەوە مەشغوڵی دەكەن، ئەم بە ناو عەشقو دەستبازیو دەستگەرمكردنەوە بە یەكتر وەكو تریاك گەنج مەشغوڵی دەكاتو كە ئالودەی بوو ئیتر هیچی لە بیر نامێنێ! كاتی خۆی (میشێل عەفلەق) بە (صدام حسین)ی گوتبوو: ئەگەر زانیت لە وڵاتدا موشكیلەو گیروگرفتێكی میللەت هەیەو بۆت چارەسەر ناكرێ وەرە موشكیلەو گرفێكی تر دروست بكە تاوەكو مەشغوڵیان بكەیو ئەوەی پێشتریان بیر بەریتەوە!! لەم مەسەلەی ڤالانتاینەشدا ئەگەر دەسەڵاتو ڕاگەیاندنەكان ئەوەندە دڵسۆزی كچ و كوڕە گەنجەكانن بۆ نایەن خانوو ئیشوكار و دامەزراندن بۆ ئەو كوڕ و كچانە دابین بكەن كە دەیانەوێ ببنە هاوسەری یەكتری نەك بە ناوی (ڕۆژی خۆشەویستی)یەوە تووشی لە ڕێلادانی بكەی وەكو برسیەك كە خواردنی نیشان بدەن، بەڵام نەهێڵی بی خوات، مەتعەمو كەبابخانەی ڕازاوەی بە جۆرەها خواردنی بە تام نیشان بدەیو لەم دیو شوشەكەوە نیشانی بدەی، بەڵام نەهێڵی دینارێك لە گیرفانیا بێو خۆشت بۆی نەكڕی!! ئایا ئەمە دڵسۆزی نواندنە، یان یاریكردنە بە عەقڵو كەسایەتی ئەو برسییە؟!..

سێیەم: لە وڵاتانی غەیری ئیسلامدا كە زۆربەیان شیرازەی خێزانیان تێك چووە فەراغێكو بۆشاییەك دروست بووە حكومەت دەیەوێ لانی



کەم ساڵی جارێك لە ڕۆژێکدا ئەو بۆشاییو فەڕاغەیان بۆ پڕ بکاتەوە بە درۆش بێ گوڵێکی خۆشەویستی پێشکەش بە خۆشەویستەکەی بکات، ئەو خۆشەویستەی کە بۆ ماوەیەکی کاتی هاوڕێیەتیو پاشان واز لەیەکتر دێنن، بەڵام ئێمەی موسڵمان لە سایەی ئیسلامەوە کە خاوەنی خێزانین ئەو گرفتو بۆشاییەمان نییە.

چوارەم: دەستی کوفری عالەمی ئەم جۆرە بۆنەو موناسەباتانە بەکار دێنێ بۆ لابردنو سووککردنی بەهاو نرخی خێزانو لابردنو کاڵکردنەوەی حەیاو حورمەتو ڕێز بۆ ئەوەی موسڵمان وا بزانێ بۆ خۆی هیچی نیەو دەبێ هەرخەرێکی لاساییکردنەوە بێ. ئایا (ڤالانتاین) غەیری لاساییکردنەوە هیچ ماناو مەبەستێکی تری تێدا دەبینری؟! جا بە ڕاستی حەیفە تۆ کە خاوەنی ئیسلامی، کەچی ئەوەندە بەسەزمانو دەست بەتاڵ و دڵ بەتاڵ و عەقڵ بەتاڵ بی، پەنا بۆ ڤالانتاین بەری شاعیر جوانی فەرمووە: (بێز لە بەفری کوێستان دەکرێ.... بێزوو لە ئاوی زێرابو میزی کەرە) بەڵێ قورئانو سوننەتی پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) چونکە لە ئاسمانەوە هاتوەو هەناسەی پیسی بەر نەکەوتوە، وەکو بەفری سەر لوتکەی چیای کوێستانەکان پاکو بێگەردە، دەی کێ لەو کەسە داماوترو سەرلێشواوترە کە ئاوی بەفراوی کوێستانی پێ پیسو خراپ بێو بڵێ بە کەڵك نایەتو بچێ تینویەتی خۆی بە ئاوی زێرابو میزی کەر بشکێنێ. گەنجانی بەڕێز: نەکەن بە قسەو پیلانو فێڵو



تەڵەکەی شەیتانی جنو دووپێی ئینس بکەن کاتێ پێتان دەڵێن: ئەم مەلایانە.. ئەم مزگەوتانە.. ئەم ئیسلامە.. دژی خۆشەویستییە!! باشە قەیچییەکاو چ عەیبەیەکی تێدایە کە کوڕ و کچ بە یەکەوە بە دزی کەسوکارو بنەماڵەوە دڵداری بکەنو یەکتریان خۆش بوێ؟! باشە بۆچی هەموو خوشیەك لە کوڕ و کچی گەنج حەرام دەکەن؟! ئەی گەنجانی پاكو بەڕێز: دڵنیا بن دینی ئیسلام دینی خۆشەویستییە، بەڵام لە ئیسلامدا ئەمە خۆشەویستی نیە کە:

١- کوڕێك و کچێك ژێربەژێر بە ترسو لەرزەوە بە بێ پرسی دایكو باوك بە موبایل پەیوەندی ناشەرعی بە یەکەوە بکەن، بەڵام (٨٠٪)ی زیاتری بە زەواجی شەرعیو چوونە ناو کەژاوەی زێرینی خێزانی کۆتایی پێ نایەتو زۆربەی هەرە زۆریان بە تایبەت کچان دەبنە قوربانیو بۆ ئاشنابوون بە حاڵی پەرێشانو پڕ پەشیمانی ئەو کوڕ و کچانەی بە تایبەت ئەو کچانەی کە بە حیساب خۆشەویستیان هەبووەو پەیوەندیو عەلاقەی ناشەرعیان هەبوە، وەرن تەماشای بەسەرهاتەکانیان بکەن لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا وەرن بچین سەردانی سەنتەری ژنان بکەنو لە زمانی خۆیانەوە باسی مەینەتو پەشیمانی قوربانیانی ئەو جۆرە خۆشەویستیانە بزانن کە چۆن ئاوات دەخوازن بەو کاتەی کە کچ بوونو هیچ کوڕێك نەهاتۆتە ژیانیانەوە، چونکە کوڕانێکی بە جەستە مرۆڤ، بەڵام گورگ ئاسا بوونو تەنها ئارەزوی خۆیان پێ خاڵی کردونەتەوەو پاشانیش هەر وازیان لێ



نەهێناونو هەڕەشەی ئەوەیان لێ کردون کە باسی ڕابردو یان نامەی موبایلەکانیانو وێنەکانیان ئاشکرا بکەنو تەنانەت هەندێکیان دوای شـوکردنیش هەر وازیان لێ نەهێناونو ژیانیان لێ کردون بە ژانو مێردو منالێشـیان سـەرگەردان بوون بە هۆی ڕابردووی ئەمانەوە، بەڵـێ ئیسـلام دژی ئەم جۆرە بـە ناو خۆشەویسـتییە لە واقیعدا دەستبڕینەیە!

٢- ئیسلامی ئێمە ئەوەی ڕەفز کردوە کە ماوەی چەند ساڵ کوڕ و کچێـك بە یەکـەوە دڵداری بکەن، ئەمجا دوای ئەوە بچنە خانەی هاوسەریەوە. بۆچی؟! چونکە دواتر لە ژیانی هاوسەریدا بەختەوەر نابـن، چونکە لە ژیانی هاوڕێیەتیو دڵداریدا هەردووکیان بە قسـە هەر قوربانی یەکتر بوون، بەڵام لە ژیانی واقیعی هاوسـەریدا کاتێ دەیـان داواکاری ژیان دەچێتـە ملیان، ئەمجا بۆیان جێبەجێ نابێو دەکەونـە دەمەبۆڵـە بەرامبەر یەکترو ژیانیان خۆشەویسـتی تێدا نامێنێ، چونکە هەموو هەستی سۆزو خۆشەویستیان بەو چەند ساڵە خۆشەویسـتییەی پێش زەواج کاڵ بۆتەوەو ئێستا کە ساڵی یەکەمی هاوسەریانە وەکو ئەوە وایە شەش حەوت ساڵ بێ هاوسەری یەکتری بـن!! بۆیە زۆربەی ئەوانەی دوای چەندین سـاڵ لە خۆشەویسـتی ژێربەژێـرو نهێنـی بوونە هاوسـەر، دوای ماوەیەکی کەم لە یەکتر بێزار بوون، ئەمە هۆکارەکەی ئەوەیە کە باسمان کرد، بەڵام ئەگەر کوڕ و کچ بە پوختی یەکتریان ناسـیو پاش ماوەی یەکترناسـینو





ڕاکۆڕینەوەو هەڵسەنگاندنی یەکتری چوونە خانەی هاوسەریەوە ئەوا لەم کاتەدا، چونکە خۆشەویستی نێوانیان سەرەتایەتی‌و لاوەو گەنجە دوای زەواج ئەو هەموو گرفتەی ژیان کە دێتە ڕێگەیان، دەی کەنە قوربانی ئەو خۆشەویستییە پاشانیش منداڵ پەیدا دەبێ‌و وردە وردەماڵیش دەبێ‌و خێزانەکە پایەدار دەبێ، ئەم هەموو تەڵاقەی ئەمڕۆ کە زۆربەی چوار مانگو هەیانە ساڵێکە گواستراوەتەوە، هی ئەوەیە چەند ساڵە خۆشی دەوێ، بەڵام هەر خۆشەویستی ڕووکەش هەر مۆبایل‌و نامە ناردن و نوکەکردن‌و گوڵی ڤالانتاین، بەڵام کاتێ بە حەڵاڵی بە یەك دەگەن لێی بێزار دەبێت دەڵێن: گەنجێك لەگەڵ دڵدارەکەیدا لە شەوێکی مانگە شەودا بە دزیەوە چووبوونە دەرەوە لەو دانیشتنە ناشەرعیەیاندا کچەکە سەیری مانگی کردو گوتی: ئەو شتە جوانە چییە؟ کوڕەکە وتی: ئەوە ڕوناکی جوانی دەموچاوی تۆیە، دوای ئەوە کە بوە هاوسەری‌و گواستیەوە، پاش چەند ساڵێك شەوێکی مانگەشەو ئەم ژن‌و مێردە ئەمجارەیان کە حەڵاڵی یەکتری بوون، بە یەکەوە چونە دەرەوە، ژنەکە بە مێردەکەی گوت: ئەو شتە جوانە چییە بە ئاسمانەو؟ (بە پەنجەی ئاماژەی بۆ مانگی چواردە کرد)، چونکە قسەکەی کاتی دڵداری هەر لە بیر مابوو، مێردەکەی وتی: خۆ کوێر نیت، ئەوە مانگە مانگ، چونکە ئیتر دەموچاوی ئەوی لەبەرچاو مانگ نییە، ئەوە پێشتر بەسەر چووا!!

٣- بە پێی ئامارێك (٦٥٪)ی تەڵاق هۆکارەکەی خیانەتی هاوسەرییە،





چونکە ئەو کورە پێش ژنهێنانی فێر بووە هەر ڕۆژەی لەگەڵ کچێکدا پەیوەندی هەبووە یان کچەکەش پێش شـوکردنی فێری ئەوە بووە هـەر ڕۆژەی لەگەڵ کوڕێکدا پەیوەندی هەبـووە، ئیتر ئەمەیان لێ بۆتە خو، وەکو تریاك کێشان وایەو پێی ئالودە بوونو ئێستاش ئەم کەسە دوای ژیانی هاوسەریشی هەر بۆی تەرك ناکرێ. لە گۆڤارێکدا خوێندمەوە کە کێشەی جیابونەوەی ژنو مێردێك لە یەکتری ئەوە بـووە کە: پیاوێـك هەرچەندە ژنی هەبوەو دوو منالێشـی هەبووە کەچی سـێ جار لە دوای پێکهێنانی ژیانی هاوســەریەوە پەیوەندی لەگەڵ کچاندا بەستوەو خۆی بە کوڕ پێ ناساندونو خەڵەتاندونیو دواتـر لـە ڕێگـەی مۆبایلەکەیەوە ژنەکـەی پێی زانیـوەو بڕیاری جیابوونەوەی داوە لەم هاوسەرە ناپاکە، جا بە ڕاستی ئەم پیاوە لە دوای پێکهێنانی ژیانی هاوسەریو بوونی ژنی خۆیدا فێری خیانەتی هاوســەری نەبووە، بەڵکو ئـەوە پێش پێکهێنانی ژیانی هاوسـەری فێری ئەم پەیوەندیە ناشـەرعیانە بوەو ئێستاش لەگەڵ ئەوەدا کە ژنی هەیە بۆی تەرك ناکرێو بە پلەی یەکەم کێ بوە قوربانی؟ هەر ئافرەتانن ژنەکەی خۆیو ئەو کچانەش کە ئەم خەڵەتاندونی..

دەی ئیسـلام دەفەرموێ: با ئەم ڕابواردنە بە ناو خۆشەویسـتییە کە هەموی ئاخو داخەو دڵی تیراویە نەبێ بۆ ئەوەی ژیانی خێزانیت هەتا هەتایە پاکوخاوێن بێو بە ئاسودەیی بژی... جا ئایا ئیسلام دژی خۆشەویستییە؟! بێگومان نەخێر، بەڵکو خۆشەویستی ڕزگار دەکات.



٤- ئیسلام ڕێزی هەموو مرۆڤێك دەگرێ. ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾. بە تایبەتی ڕێـــزی زۆری لە ئافرەت گرتووە، چونکە ئافرەت ئەگەر نیـــوەی کۆمەڵ بێ دایکی نیوەکەی تریشـــە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: [رِفقـًا بالقَوارِير]. کچ وەکو شوشـــە وایە کە شـــکا جێی خۆی ناگرێتەوە، ئەمڕۆش زۆرێك لەو کوڕانەی کە بە دوای داوی دڵداری کچانـــەوەن بە نـــاوی خۆشەویســـتییەوە گورگن‌و بـــە کەڵبەکانیان شوشـــەی ناسکی کچان دەشکێنن، مامۆســـتایەکی بەڕێز لە وتارێکدا لە یادی (ڤالانتاین)دا. فەرموی: کوڕێك لە برادەرەکەی خۆی پرسی: ئـــەرێ وا ئەزانـــم فلان کچت خۆش دەوێ، ئایـــا کەی بە تەمای بی خوازی؟! ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: جارێ تەرابیم پێ نەداوە!!.. ئەی خوشکم ئاگاداری خۆت بە نەبی بەو ئوتومبێلەی کە خەڵکی تەرایی پـــێ دەدات، تۆ مرۆڤێکی بەڕێزی، تۆ شوشـــەی پاکـــی گرانبەهای‌و قبوڵـــی پەڵـــەی پیس ناکـــەی، نەهێڵی کوڕی گورگ ســـفەت بتکات بـــە ئوتومبێل!! دڵنیاش بن هەموو ئەوانەی کە ڕەخنە لە ئیســـلام دەگرن‌و دەڵێن: ئیسلام‌و موسڵمانان دژی خۆشەویستین، ئەوانە وا لە خۆشەویستی گەیشتون کە کوڕێك بچێ دەستی کچێك بگرێ‌و مانگێ بی بات لەگەڵیا بگەڕێ‌و پاشان ئەگەر بە دڵی بوو بی خوازێ‌و ئەگەر بە دڵیشـــی نەبوو بی باتەوە ماڵی باوکی -ئەگەر زۆر ڕێکوپێك بێ- ئەینا هەر لەســـەر جادە وازی لێ بێنی‌و بڵێ نامەوێ! دەپرسن: ئایا ئەم کچە لەم دوو حاڵەتە دەردەچێ؟







١- یـــان ئەمەی لـــێ دەبێت بە خوو پێی ئالـــودە دەبێو ئەویش دەچـــێ بۆ لای کوڕێکی تر وەختێ بە خۆی دەزانی بەهاری تەمەنی بەرەو پایزی خەزان چوەو جوانیەکەی لەدەســـت داوە، ئەمجا کەس ژیانی هاوســـەری لەگەڵ پێك ناهێنیو سەرەنجام لە خێزانو ماڵ و منداڵـــی خۆی کە مایەی ســـوکناو حەوانەوەو ســـۆمای چاون بێبەش دەبێو هەموو ساتێکی مردنێکە.

٢- یـــان بە وەی ئەو کوڕە وازی لێ هێناوەو دەســـتبەرداری بوە، هەموو ژیانی لێ دەبێ بە مەراقو خەمو پەژارەو وا ڕەشبین دەبێت بەرامبەر بە ڕەگەزی بەرامبەر کە سیقەو متمانەی بە هیچ کوڕێك نامێنیو ناتوانێ ژیانی هاوبەشی لەگەڵ هیچ کوڕێك، تەنانەت ئەگەر ڕێکوپێکو دیندارو بەڕەوشـــتیش بێت پێك بێنێ، تەنانەت جاری وا هەیە لە ژیان بێزار دەبێتو خۆی دەکوژێتو خۆی خەسارەتمەندی دونیاو دوارۆژ دەکات، خۆ ئەگەر کوڕەکەش لە لایەن کچەکەوە وازی لێ هێنراو ناپاکی بەرامبەر کرا، هەر هەمان چارەنوسی تووش دەبێت، کەواتە: ئیســـلام لەبەر خاتری مرۆڤە بە کوڕ و کچەوە کە ئەم بە ناو خۆشەویســـتییەی قەدەغە کردوە، چونکە لە ڕاستیدا لەناوبەری خۆشەویستییە. لە (٢/١٤)دا لە ساڵی (٢٠٠٨)دا. لە مەوقیعی -العربیە- لەســـەر ئینتەرنێت بڵاو کرایەوە کە: لە وڵاتی (تایلاند) لە بانکۆکی پایتەختـــی ئەو وڵاتە کە پێی دەوتـــرێ -عاصمە الخطیئة- چونکە ئەوەندەی گوناهو بێشـــەرعی لێ دەکرێ، بەڵام پارێزگاری شار وتی:






با ڕۆژی (٢/١٤) بکەین بە ڕۆژی پاکی خێزان وە وتی: قەدەغەیە هیچ ئوتێلێك یان هۆڵێك لە ڕۆژی (ڤالانتاین)دا ئەو یادەی تێدا بکرێتەوە، بۆ ئەوەی ڕێگـری لەو هەموو خراپەکاریە بگرین.. بەڵێ لەوێ ئاوا لێی بێزارن، کەچی تازە لێرە دەهۆڵی بۆ دەکوتن!!.. بە ڕاستی جێگای داخە کە ئێمەی میللەتی کورد نەمانتوانی لە بەرامبەر جیهانگیریدا سادەترین بەرگری بکەین لە کەلتورو دابو نەریتە باشەکانی خۆمان، دەبوایـە ئێمـەش وەك میللەتانی تر کەلتـوری خۆمان بە جیهانی بکردایـەو بماننناسـاندایە بە جیهـان، بەڵام بە داخـەوە نەك هەر نەمانتوانـی ئەم کارە بکەین، بەڵکـو بە تەواویی خەریکە کەلتوری خۆمان لە دەست ئەدەین و نزیکە بتوێینەوە لە نێو بۆتەی کەلتوری وڵاتانی خۆرئاواو ئەمریکادا، ئەوەی پشـکی شـێری بەردەکەوێت لە چاندنـی تۆی کەلتـورو دابونەریتە ناپەسـەندەکانی وڵاتانی تر لە نێـو کومەڵگەکەماندا ڕاگەیاندنە، لەبری ئـەوەی ڕۆڵیکی پۆزەتیف بگێـڕن بە پێچەوانەوە ڕۆڵێکی نێگەتیڤیان گێڕاوە، لێرەدا نامەوێت بڵێـم با ئێمـە کۆمەڵگەیەکی داخراو بینو سـوود لـە ئەزموونو پێشـکەوتنەکانی وڵاتانی تـر وەرنەگرین، بـە پێچەوانەوە دەبێت گشـت تەقەللاو کۆششێکمان جەم بکەین لە پێناو سوودوەرگرتن لە ئەزموونـە بەکەڵکەکانی وڵاتانی تر. لەهەمان کاتدا دەسـت بگرین بـە کەلتورو نۆرمە باڵاکانی خۆمانـەوە، مەخابن ئەوەی ئێمە ئەی بینین وەك زۆربەی تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیە نەك هەرنەمانتوانیوە










ئەزمونــە ســەرکەوتوەکانی وڵاتانــی تر دووبارە بکەینــەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە گیرســاوینەتەوە بە شــتە ڕواڵەتیو پۆخڵەواتەکانی وڵاتانــی تر، بــە تایبەت ئەمریــکاو ئەوروپییەکان. ئــەوەی لێرەدا بابەتی ئێمەیەو قسەی لە بارەوە دەکەین یادی ڤالانتاینە، ئەو یادەی بۆ چەند ســاڵێکە لە کوردســتاندا ڕاگەیاندنەکانو کۆمەڵێك لایەنو دەســتە ڕەواجێکی زۆریان پێداوەو زیاد لە قەبارەی خۆی گەورەیان کــردوەو زینــدوی دەکەنەوە، بە بێ ئــەوەی خوێندنەوەیەکی وردو زانستیانەی بۆ بکەنو بزانین تاچەند بە دەردی گەنجانو تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیە دەخوات. یان ئەوان ئەیانەوێت لەم ڕێگەیەوە بدەن لــە ئەخلاقو بەها باڵاکانی ئەم میللەتــە. لەوانەیە بڵێن: ئێمە کە یادی ڤالانتاین ئەکەینەوە باس لە چیرۆکی خۆشەویســتی دەکەینو خۆشەویســتیش دیاردەیەکی جیهانیەو لە هەموو زەمانو مەکانێکدا بوونــی هەبووەو هەیە، ڕاســتە خۆشەویســتی دیاردەیەکی جیهانیە، بــەڵام یادی ڤالانتاین بە هیچ شــێوەیەك پەیوەندی بە ئێمەوە نی یەو بەو شــێوە کوێرانە شــوێن خەڵك کەوتنەو بــە گۆرانی خەڵك هەڵپەڕینە، دەبێت چی قەڵایەکی سەختمان بۆ بگرێتو چ لۆژیکێکی تێدا بێتو دەرمانی چ دەردێکمان بکات ئەگەر ئەوان ڕاســت دەکەن باس لە چیرۆکی خۆشەویســتی دەکەن بۆچی نایەن ئیلهام لە مەم و زینەکــەی ئەحمــەد خانیو شــیعرەکانی نالیو مەحویو ســالمو حەمدیو شــاعیرانی تر وەربگرنو چیرۆکی نالیو حەبیبەو شەمو




وەڵــی دێوانــەو دەیانی تر زینــدوو بکەنەوە، باس لــە حەقیقەتو کرۆکی خۆشەویستی بکەن، بۆچی خۆیان خەریك دەکەن بە توێکڵی خۆشەویســتیەوە. خۆشەویســتی لە خۆرئاوادا بە شێوەیەکی گشتی چوارمێخە کێشــراوە. چونکە ئەو وڵاتانــە وڵاتگەلێکی ماددەگەرانو لا بــە لای لایەنــە مەعنەویەکاندا ناکەنــەوە، ناتوانم بڵێم بە هیچ شێوەیەك خۆشەویستیان تێدا نییە، بەڵام ئێمە بە شێوە گشتیەکەی باسی لێ دەکەین، پیاوە ژیرو بلیمەتەکانی ئەوروپا وەکو ساویلکەکان لە باسی عیشقو چارەی دەردی عیشقدا هەموو دۆش داماون، هەروەك مەحوی دەفەرموێ:

(دوهاتــی ئەوروپــا وەك ئەهلی دێهات.... لە چارەی دەردی عیشــقا جوملە دامان) دەی کە مادام خۆمان خاوەنی خەرمانێك لە ئەدەبیاتی خۆشەویستین، بۆچی خەریك بین بە زیندوکردنەوەی یادێکەوە نە لە دوورو نــە لە نزیك پەیوەندی بــە ئێمەوە نییەو خزمەتێك بە ئێمە ناکات وە یادکردنەوەی ڤالانتاینو زیاد لە قەبارەی خۆی گەورەکردنی نــەك نابێتە هۆی زیندوکردنەوەی خۆشەویســتی، بەڵکو دەبێتە هۆی کوشــتنی.. ئایا کێ هەیە وەکو -مەحوی- ئاوا بە جوانی باسی عیشق بــکاتو بڵێ: نابێت بە هیچ چەشــنێك عاشــق ڕێگەیەکی نادروســت بگرێتەبەر بۆ گەیشتن بە مەعشوقەکەی، بەڵکو ئەگەر زانی یار بێزارە لێی بە بێ ئەوەی پێی بڵێت، دەبێت خۆی بڕوات وەکو دەفەرموێ: (کە ڕوحم تێگەیی تۆ حەز بە دەرچوونی دەکەی دەرچوو).



دەبێ عاشق کە دی بێزارە یاری، بێ بڕۆ بڕوا..)

بەڵێ پێویستە ئەوەش بڵێین کە عەشقو خۆشەویستی ڕاستەقینە ئەوەیە کە لە ڕوحەوە سەرچاوەی گرتبێت، نەك لە غەریزەوە هەڵقوڵابێت. چونکە ئەگەر لە غەریزەوە سەرچاوەی گرتبێت ئەوە نەك هەر عەشق نییە، بەڵکو حەزێکی سەرشێتانەیە...

ئیمانداران: لە کۆتایی ئەم وتارەدا داوای لێبوردن لە پێغەمبەری خوا دەکەم (ﷺ) کە لەم وتارەدا کەمتر فەرمودەی شیرینی ئەو سەروەرەمان خوێندەوە کە ناچاربوین لەبەر پاراستنی گەنجە خۆشەویستەکانمان هەندێ قسەوباس لەدەرەوەی قورئانو فەرمودەکانی پێغەمبەری خوادا بکەین ئەینا وتاری بەهێزو بەپێزو بەرەکەت ئەوەیە کە زۆرترین فەرمودەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) تێدا باس بکرێ، بۆیە لە کۆتایی ئەم وتارەدا دەڵێم: ئەی گەنجو لاوەکان یەقینتان بێ تاکە دڵسۆزتان پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە بەردەوام لەخەمی گەنجاندا بووە، وە لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە خێزانیان بۆ پێك بێنێ... دەچینە شاری مەدینەو گەنجێکی مەدینەیی زۆرکات لە خزمەتی پێغەمبەردایە، گەنجێکی هەژار لەبواری داراییدا، لە باڵادا کورت، لە دەموچاوو ڕوخساردا زۆر بەرچاو نەبوو، ڕەشپێست بوو لە بنەماڵەیەکی نەناسراو بوو، تەنانەت نازانرێ باوکی ناوی چییە. [قالَ إبْنُ حَجَر فى الاطـابَة ج١ ص٦٠٠ : غَيْرُ مَنْسُوب، أي لَمْ يفظ لَهُ التَّاريخُ نَسَبـاً] ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم گەنجە دەفەرموێ: ئەی





جولەیبیب (ناوی جولەیبیب بووە) ئەوە بۆچی ژیانی هاوسەری دروست ناکەی، بۆ خۆت؟ جولەیبیب لە وەڵامدا وتی: [إذاً تجدُ كاسداً – هُوَ غَيْرُ المَقْبُولِ وَالمَرْغُوبِ فيه] ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاخر من کەسێکی ناشیرینم، سیماو ڕوخسارێکی وام نییە کە هیچ کچێك پێم رازی بێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: [غَيْرَ أَنَّكَ عِنْدَ اللهِ لَسْتَ بِكَاسِدٍ]. بەڵام تۆ لە لای خودا ناشیرین‌و ناقۆڵاو نەخوازراو نیت، چونکە لە ئیسلامدا ڕێزی مرۆڤ بە تەقوایە. ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾. تەقواش لە دەموچاودا نییە، وا لەدڵدایە. [التَّقْوى هاهُنا وَ أشـارَ إلى صَدْرِه] تەقوا لەناو سینەدایە. پێغەمبەر (ﷺ) وای فەرموو.

شاعیریش ووتویەتی:

[جمال الوجه مع قبح النفوس......كقنديل على قبر المجوسي].

دەموچاوی جوان بێ دڵی پاك‌و عەقڵی گەورەو زمانی شیرین هیچ نییە. بەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بەڵام من کچی فلان کەسی ئەنصاریت بۆ دەخوازم پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە باوکی کچەکەی وتو پێشنیارەکەی خستە بەردەم. ئەویش ووتی: [حَتّى أَسْتَأْمِرَ أُمَّها] هەتا پرس بە دایکی نەکەم‌و ئەویش لە کچەکەی نەپرسێ ناتوانم هیچ وەڵامێکت بدەمەوە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: [فَنِعْمَ إذاً]. ئەمە زۆرباشە. بەڵێ کاتێ ئەم پیاوە بۆ ژنەکەی باس کرد. ژنەکەی بە سروشتی ژنانە گوتی: [لا ها اللهِ إذاً أما وَجَدَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) إلاَّ جُلَيْبِيباً ؟!]. هەرگیز شتی وا نابێ ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەسی نەدۆزیەوە



بۆ کچەکەمان ئەو جولەیبیبە ناشـرینە ڕەشە بێکەسە نەبێ؟!! لەم کاتەدا کچەکەیان لەودیوو دەرگاوە خەریکی ئیشوکاری ماڵ بوو. کە گوێـی لـەم گفتوگۆیەی نێوان باوکو دایکی بـوو، هاتە لایانو پێی وتـن: باوکە گیـان ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بـۆ خۆی پێی وتیو خۆی خوازبێنی منی له تۆ کرد بۆ جولەیبیبە؟! باوکی وتی: بەڵێ کچەکە وتی: [إدفَعُوني إلَيهِ فأنَّهُ لَن يُضَيعُني] ئـەی باوکە ئەی دایکە مادام ئەم کـوڕە پەسـەندکراوی پێغەمبەری خوایـە (ﷺ) ئیتر لای من پەسەندەو دڵنیام حورمەتەم دەگرێو زایەم ناکاو لەگەڵی بەختەوەر دەبـم!!... ئەی ئافەرین بۆ ئەو عەقڵە گەورەی ئەو کچە بەڕێزە کە ئاوا بە جوانی پێغەمبەری خۆشەویسـتی ناسـیوە، بەڵێ کە کچەکە ئاوا بە ڕاشـکاوی ڕەئی خۆی دەربڕی باوکو دایکیشـی ڕازی بوونو سەرەنجام لێی مارەکراو پێغەمبەریش (ﷺ) دوعای خێری بۆ کردنو فەرمووی: إن شاءالله زۆر بەختەوەر دەبنو زۆر ساماندارو دەوڵەمەند دەبـن، بەڵـێ ئەم ژنو مێردە خێزانێکـی زۆر بەختەوەر بوونو لە ماڵـە هەرە دەوڵەمەندەکانـی مەدینە بوون. بەڵـێ دوای ماوەیەك جولەیبیـب لـە غەزایەکدا لە خزمەت پێغەمبـەری خوادا چوو بۆ غەزاو لەو جەنگەدا شەهیدبوو، دوای تەواوبونی شەڕەکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: کێ لە هاوەڵان دیار نییە؟! وتیان: فلانو فلانو فلان، جاری دوەمو سـێیەمیش کە هەمان پرسیاری کردەوە صەحابەکان وتیـان: فلانو فلانو فلانیش دیار نین، لە جاری سـێیەمدا وتیان:




کەسی تر نیە دیار نەبێ ئا لێرەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم گەنجەی هەر لە بیرە فەرمووی: [لكنّي أفقدُ جُلَيْبيبًا فاطلبوهُ] بەڵام من جولەیبیبم لێ ون بوەو نایبینم، هەستن بە شوێنیا بگەڕێنو سۆراغی بکەن کاتێ بۆی گەڕان دۆزیانەوە حەوت کافری بە چوار دەوردا کەوتبوو. پێغەمبەری خوا (ﷺ) چوە سەر لاشەکەیو فەرمووی: [قتل سَبْعةً، ثمَّ قَتلوهُ، هذا منّي، أنا منهُ، هذا منّي وأنا منهُ]. فەرمووی: حەوت کەسی لە کافرەکان کوشتوە پاشان کوشتویانە، ئەم جولەیبیبە لە منەو منیش لەوم ئەوە لەمنەو منیش لە ئەوم !! الله أكبر لەو پلەو پایەیە [فوضعَهُ على ساعدَيْه] ئەمجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) جولەیبیبی خستەسەر هەردوو باسکی خۆیو لە باوەشی گرت. بەڵێ لە کۆتایی ژیانی دونیاییدا. جولەیبیب هەردوو قۆڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە جیاتی دارەمەیت هەڵیان گرت بۆ لای گۆڕەکەیو بە دەستی پێغەمبەر (ﷺ) خرایە گۆڕەوە. بە بێ شۆرین، هەر بە جلوبەرگە خوێناویەکانی خۆیەوە، چونکە شەهیدە. رواه مُسلم (٢٤٧٢).

ئەی گەنج ئایا تۆش ئاوا دەستت خستۆتە دەستی پێغەمبەری خواوەو پەیمانت پێ داوە کە لە سەر ڕێبازو بەرنامەی ئەو خۆشەویستە بی. هەتا ئەویش پێت بفەرموێ: [ هذا منّي وأنا منهُ] ئەمە کوڕی منە، برای منە خزمی منە، کەسی منە.

دەی وەرن با هەوڵ بدەین لە ناخی دڵمانەوە بڕیار بدەینو بەڵێن بدەین کە بە پێی قورئانو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) هەنگاو هەڵ



بگرین، ئیمە شـوێنکەوتوی پێغەمبەرین، شاگردو قوتابی خولەفای ڕاشـیدینو چاکانو پاکانی ئەم ئیسلامەین. بڕیار بدەین کە بێبەری بین لـە هەموو کوفرێك. شـرکێك. بێدینیـەك. بیدعەیەك گاورو جولەکایەتیەك. قەشەو کلاوسورێك هەموو فڕێدراوێکی ناو زبڵدانی خەڵك. بەڵکو شـانازی بە ئیسـلامەکەی خۆمانـەوە دەکەین. و بە پشـتوانی خوا لەسەری ئەژینو لەسەری ئەمرین، خوای پەروەردگار پشـتو پەنای هەموو لایـەك بێتو هەموو گەنـجو لاوەکانمان بە ئاواتـی ڕەوای خۆیـان کە خوای گەورە بۆی دیـاری کردون بگەنو ژیانێکی پڕ لە خۆشەویستی پێك بهێننو بە خۆشەویستییەوە بژین.


سەرچاوەکان:

١)- گۆڤاری ستاندەر، ژمارە: ١٨ ئابی ٢٠٠٨ ، ل٦١.

٢)- سيرة شهداء الصحابة، فؤاد بن سراج عبدالغفار، ص٣٦٠.

٣)- ڕۆژنامەی کۆمەڵ، ژمارە ٣٦٠، ٢٠٠٩/٢/١٤، ل٩.


